ویلیەم شێکسپیر

# شانۆیی ماکبێس

شانۆگەری

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

**ئازاد حەمە شەریف**

چاپی بژارکراو



ئەم وەرگێڕانەم پێشکێشە بە:

«ئەو سەرکردانەی هەرگیز ڕێگای ماکبێس ناگرنە بەر و

کاتێ دەگەنە تەختی دەسەڵات خۆشەویستیی میللەت نادۆڕێنن»

ناوی کتێب: شانۆیی ماکبێس - شانۆگەری

نووسینی: ویلیەم شێکسپیر

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئازاد حەمە شەریف

بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٩٢

هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

بەرگ: مەریەم موتەقییان

چاپی دووەم، هەولێر- ٢٠٠٨

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە(٦٣)ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

## پێش گۆتن

شێکسپیر چیرۆکی ئەم شانۆنامەیەی لە کتێبێکی مێژوونووسی ئینگلیزی (رافائیل هۆڵنشید)ەوە وەرگرتووە ناونیشانی کتێبە بە نرخەکەی (هۆڵنشید) مێژووی ئینگلتەرا و سکۆتلەندا و ئێرلەندایە (١٥٨٦). بەڵام شێکسپیر ئەم چیرۆکەی هەروەک خۆی دانەڕشتۆتەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی زۆر هونەری و درامی مامەڵەی لەگەڵ ئەم چیرۆکە کردووەو لە بەرگێکی نوێدا پێشکەشی کردۆتەوە و بیروباوەڕی خۆی دەربارەی مرۆڤی زۆردار و سایکۆلۆجیەتی فەرمانڕەوای عەسکەری زۆر بە روونی دەربڕیوە.

سەرەنجام شێکسپیر شانۆنامەیەکی زۆر بەهێزی بەناوونیشانی ((ماکبێس )) لە دەوروبەری ساڵی (١٦٠٦)و واتە بیست ساڵێک دوای کتێبەکەی هۆڵنشید نووسیوە و ساڵی(١٦٢٣) بە چاپی گەیاندووە. گرینگی ئەم شانۆنامەیەی شێکسپیر لەوەدایە کە نزیکەی چوار سەد ساڵێک لە مەوبەر نووسراوە، بەڵام تا ڕۆژی ئیمڕۆش کەسانی وەک ئەوانەی ناو ئەم شانۆنامەیە لە زۆر کۆمەڵگەی جیهاندا دەبینرێن؛ ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە سایکۆلۆجیەتی مرۆڤی عەسکەری بەزۆری روو لە زوڵم و خوێنڕشتن و خۆسەپاندن و یاساشکێنی و پیلانگێڕییە. جاهەرکاتێک ئەو مرۆڤانە هاتنە سەر تەختی دەسەڵات، با جاران مرۆڤی وڵاتپارێز و دڵسۆز و نیشتیمانپەروەریش بووبن، دەبنە مرۆڤی دیکتاتۆر و خوێنڕێژو دز و تالانچی و وڵات تێکوپێک دەدەن و هەرچی خراپە هەیە لە دژی گەل و نەتەوەکەیان دەیکەن، چونکە ئەو جۆرە مرۆڤە (ماکبێس)یانە مرۆڤی ناشارستانی و بەرژەوەندیخوازن و ئەوەندەی بڕوایان بەزەبری شمشێر هەیە سەد یەکی ئەوە بڕوایان بەتوانای عەقڵ و مێشک نییە.

هەروا ئەو چەشنە مرۆڤانە خۆیان چاک دەزانن بارودۆخێک ئەوانی گەیاندۆتە چڵەپۆپەی دەسەڵات دەنا هەر کاتێک وڵات لە ئارامیدا بژیت دەبێ ئەوان نەمێنن، بۆیە



ئەوانە بە بەردەوامی هەوڵی شەڕ دەدەن و خەڵک لە نائارامی و پشێویدا دەژیێنن تا تەمەنی خۆیان کەمێک درێژتر بکەنەوە.

سەرەنجام، هێزی لەبن نەهاتووی میللەت هەتا هەتایە لێیان بێ دەنگ نابێت و لێیان دێتە دەست و سەرنگومیان دەکات و تەختوتاراجیان تێک دەشکێنێ و دەسەڵات دەبەخشێتەوە ئەوانەی بەڕاستی وڵاتپەروەرن و شایستەی فەرمانڕەوایین.

ئازاد

١٩٩٤/٢/٨

**تێبینی:** زمانی ئەم شانۆییە لە لایەنی هونەرییەوە دوو جۆرە: لە هێندێک جێ بە شیعر نووسراوە: شیعری سەروادار و شیعری ئازادی بێ سەروا؛ لە هێندە شوێنی تردا بە پەخشان نووسراوە. منیش لە کاتی وەرگێڕاندا خۆم پابەندی دەستپاکی کردووە و شیعرەکانم بە شیعر و ئەوەی پەخشانە وەک خۆیم وەرگێڕاوە.

وەرگێڕ

**تێبینی:** ئەم دەقە لەم سەرچاوەیە وەرگێڕراوە:

William Shakespeare, New Swan Shakespeare Macbeth, (ed.)by Bernard Lott (London: Longman,1978)

## کەسێتییە درامییەکان

دەنکەن: شای سکۆتلەندا

ماڵکۆڵم، دۆناڵبێن: کوڕانی شا

ماکبێس، بانکۆ: سەرلەشکری سوپای شان

ماکدەف، لینۆکس، رۆز، مێنتیــث، ئەنگەس، کاثـنیس: گەورە پیاوانی سکۆتلەندا

فلینس: کوڕی بانکۆ

سیوارد: سەرداری ناوچەی نۆرزمبەرلەند و سەرلەشکری سوپای ئینگلیزە

گەنج سیوارد: کوڕی سیواردە

سەیتن: ئەفسەرێکە یاوەری مێنتیــثە

نووشـــدەرێکی ئینگلیــزی، نۆشــدەرێکی سکۆتلەندی، ســـەربازێک، دەرگـاوانێک، پیرەمێردێک.

خاتوو ماکبێس

خاتوو ماکدەف

یاوەرژنێک کە لەگەڵ خاتوو ماکبێسە.

هێکێت سەرۆکی جادووگەران – و سێ جادووگەر

چەند گەورەپیاو و جوامێر و ئەفسەر و سەرباز و پیاوکوژ و یاوەر و پەیامبەرێک.

تارمایی بانکۆ و چەند تارماییەکی دی.

«هەموو دیمەنەکان لە سکۆتلەندا ڕوو دەدەن، جگە لە پەردەی (٤)ی دیمەنی(٣) کە لە ئینگلتەرا ڕوو دەدات.»



## Dramatis Personae

DUNCAN, King of Scotland.
MALCOLM, the king’s Son.
DONALBAIN, the king’s Son.
MACBETH, General in the King's Army.
BANQUO, General in the King's Army.
MACDUFF, Nobleman of Scotland.
LENNOX, Nobleman of Scotland.
ROSSE, Nobleman of Scotland.
MENTETH, Nobleman of Scotland.
ANGUS, Nobleman of Scotland.
CATHNESS, Nobleman of Scotland.
FLEANCE, Banquo’s Son.
SIWARD, Earl of Northumberland, General of the English Forces.
YOUNG SIWARD, Siward’s Son.
SEYTON, an Officer attending Macbeth.
BOY, Macduff’s Son
An English Doctor. A Scotch Doctor. A Soldier. A Porter. An Old Man.
LADY MACBETH.
LADY MACDUFF.
Gentlewoman attending on Lady Macbeth.
HECATE,and three Witches.
Lords, Gentlemen, Officers, Soldiers, Murderers, Attendants, and Messengers.
The Ghost of Banquo and several other Apparitions.

**The scenes are laid in Scotland, with the exception of IV, iii, which takes place in England.**

# Scene I
## An Open Place

*[Thunder and lightning. Enter three Witches.]*

**FIRST WITCH:**

When shall we three meet again?
In thunder, lightning, or in rain?

**SECOND WITCH:**

When the hurlyburly's done,
When the battle's lost and won.

**THIRD WITCH:**

That will be ere the set of sun.

**FIRST WITCH:**

Where the place?

**SECOND WITCH:**

Upon the heath.

**THIRD WITCH:**

There to meet with Macbeth.

**FIRST WITCH:**

I come, Graymalkin!

**ALL:**

Paddock calls:--anon:--
Fair is foul, and foul is fair:
Hover through the fog and filthy air.
[Exeunt.]



# دیمەنی یەکەم

## شوێنێکی بەرهەڵدایە

(گرمە و هەورە تریشقەیە، سێ جادووگەر دەردەکەون).

**یەکەم جادووگەر:** کەی هەرسێکمان یەکتر ببینین؟
کاتی گرمە یان تریشقە یان باران بارین؟

**دووەم جادووگەر:** ئەو دەمەی ئەو پشێوییە نامێنێت
جەنگ بە دۆڕان یان سەرکەوتن کۆتایی دێت.

**سێیەم جادووگەر:** ئەوەش پێش خۆرئاوا دەبێت.

**یەکەم جادووگەر:** لەکوێ؟

**دووەم جادووگەر:** لەناو لێرەوارێ.

**سێیەم جادووگەر:** (ماکبێس)یش دەبینین لەوێ هەوارێ.

**یەکەم جادووگەر:** وادێم، بۆرە پشیلە، وا دێم!

**هەموویان:** بۆق دەقرێنێت – هەر ئێستا دێین!
چاک خراپە و خراپیش چاکە،
بە ناو تەم و بای پیس بفڕە و باڵ والاکە.
(دەڕۆن)

# دیمەنی دووەم

## چادرێک لەلای فۆریس

دەنگی کەڕەنا لە ناوەوە دێت، شا دەنکەن دێتە ژوور.

ماڵکۆڵم و دۆناڵبێن و یاوەرانی شا چاویان بە کاپتنێکی بریندار دەکەوێ

**دەنکەن** (بۆ لۆردەکان): ئەوە چییە، ئەو برینداره؟

لە حاڵی شڕی ڕا دیاره

نوێترین هەواڵی جەنگی لا ئاشکاره.

**ماڵکۆڵم:** ئەوە ئەو سەربازەیە

وەک جەنگاوەرێکی چاک و ئازا

جەنگا تا لە دیلیم ڕزگار بکا (بۆ جەنگاوەرەکە) فەرموو هاوڕێی ئازا!

هەواڵی گەرمەی ئەو شەڕە بڵێ بە شا

تا ئەو کاتەی ئەوێت بە جێ هێڵا.

**کاپتن:** هیچ دیار نەبوو،

وەک دوو مەلەوانی ماندوو لێک ئاڵابوون

کەس ڕێی بە ئەوەی دی نەدەدا کارامەیی خۆی بنوێنێت.

(ماکدۆناڵد)ی دڵڕەق (کە شایەنی ئەوەیە یاخی ببێت و

نامەردی دیکەی لێ بووەشێتەوە) لە دوورگەکانی ڕۆژاواوە

بە هێزی پیادەی سووکەڵەو چەک هەڵگری قورس یارمەتی دەدرێت،

بەختیش لەو جەنگە نەفرەتییەدا

وەک یارە سۆزانییەکەی یاخییان بۆی دەخەنییەوە، بەڵام یەکجار لاواز بوو.

بەرامبەر (ماکبێس)ی ئازا (کە شایەنی ئەو ناوەیە)

هات و بە شمشێری هەڵشەقاوی



# Scene II

**A Camp near Forres.**

*[Alarum within. Enter King Duncan, Malcolm, Donalbain, Lennox, with Attendants, meeting a bleeding Captain.]*

**DUNCAN:**

[to the Lords] What bloody man is that? He can report,
As seemeth by his plight, of the revolt
The newest state.

**MALCOLM**:

This is the sergeant
Who, like a good and hardy soldier, fought
'Gainst my captivity. *[To the Soldier]* Hail, brave friend!
Say to the king the knowledge of the broil
As thou didst leave it.

**CAPTAIN**:

Doubtful it stood;
As two spent swimmers that do cling together
And choke their art. The merciless Macdonwald,
(Worthy to be a rebel, for to that
The multiplying villainies of nature
Do swarm upon him,) from the Western isles
Of kerns and gallowglasses is supplied;
And Fortune, on his damned quarrel smiling,
Showed like a rebel's whore: but all's too weak;
For brave Macbeth, (well he deserves that name,)
Disdaining Fortune, with his brandished steel,

که هەڵمەدووی خوێنی لێ هەڵدەسا –
وەک دۆستی ئازایەتی بەختی ریسوا کرد و
رێی خۆی کردەوە تا بەرامبەر ئەو نامەردە وەستا؛
دەستی لە دەستی نەنا و ماڵاوایيشی لێ نەکرد،
تا لە ناوکییەوە تا لاچەناگەی هەڵنەزڕاند،
کەللەسەریشی لەسەر کونەباجەکانمان داچەقاند.

**دەنکەن**: ئەی ئامۆزا ئازاکەم! ئەی جوامێرە هێژاکەم!

**کاپتن**: هەروەک ئەو دەمەی خۆر هەڵدێت
ڕەشەبای کەشتیشکێن و گرمەی زراوبەر دەڕەونەوە،
هەر لەو کانییەی کە خێروخۆشی لێ هەڵدەقوڵێت
دڵتەنگیش دەربوو. ببینە شای سکۆتلەندا، ببینە!
ئەو دەمەی دادپەروەری چەکی ئازایەتی کردە شان
سەربازە پیادەکان دەستبەجێ کەوتنە غاردان،
بەڵام شای نەروێج، خۆی لە بارێکی چاکدا دیتەوە،
بە چەکی نوێ و شەڕکەری نوێوە
دەستی بە هەڵمەتێکی دی کردەوە.

**دەنکەن**: ئەرێ ئەوە (ماکبێس) و (بانکۆ)ی
سەرلەشکری ئێمەی نەترساند؟

**کاپتن**: بەڵێ،
وەکو چۆن چۆلەکە خەرتەل و کەروێشک شێر دەترسێنن.
ئەگەر راستم گوتبێت دەبێ بڵێم ئەوان
بە چەشنی تۆپی پڕ بارووی دووجار تەقییەوە
ئەوان بەڕووی دوژمنتدا دەتەقینەوە،
خەریکبوو ئەوان لە ناو زامی گەرمدا خۆ بشۆن و
کەللەسەرخانەیەکی دی بنێنەوە،



Which smoked with bloody execution,
Like Valor's minion, carved out his passage,
Till he faced the slave;
Which ne'er shook hands, nor bade farewell to him,
Till he unseamed him from the nave to the chaps,
And fixed his head upon our battlements.

**DUNCAN:**
O valiant cousin! worthy gentleman!

**CAPTAIN:**
As whence the sun 'gins his reflection
Shipwrecking storms and direful thunders break,
So from that spring, whence comfort seemed to come
Discomfort swells. Mark, King of Scotland, mark:
No sooner justice had, with valor armed,
Compelled these skipping kerns to trust their heels,
But the Norweyan lord, surveying vantage,
With furbished arms and new supplies of men,
Began a fresh assault.

**DUNCAN**:
Dismayed not this
Our captains, Macbeth and Banquo?

**CAPTAIN:**
Yes;
As sparrows eagles, or the hare the lion.
If I say sooth, I must report they were
As cannons overcharged with double cracks;
So they
Doubly redoubled strokes upon the foe:
Except they meant to bathe in reeking wounds,
Or memorize another Golgotha,

I cannot tell:--

But I am faint; my gashes cry for help.

**DUNCAN:**

So well thy words become thee as thy wounds;

They smack of honor both.--Go, get him surgeons.

**[Exit Captain, attended.]**

*[Enter Rosse and Angus]*

**[Turning]** Who comes here?

**MALCOLM:**

The worthy Thane of Rosse.

**LENNOX:**

What a haste looks through his eyes!

So should he look that seems to speak things strange.

**ROSSE**:

God save the King!

**DUNCAN:**

Whence camest thou, worthy thane?

**ROSSE**:

From Fife, great King;

Where the Norweyan banners flout the sky

And fan our people cold.

Norway himself, with terrible numbers,

Assisted by that most disloyal traitor

The Thane of Cawdor, began a dismal conflict;

Till that Bellona's bridegroom, lapped in proof,

Confronted him with self-comparisons,

Point against point rebellious, arm 'gainst arm,

Curbing his lavish spirit: and, to conclude,

The victory fell on us.

**DUNCAN:**

Great happiness!



چی دیم پێ ناگوترێت –

وا دەبوورێمەوە: برینەکانم پێویستییان بە تیمارکردنە.

**دەنکەن**: قسەکانت وەک برینەکانت

تامی سەربەرزییان لێدێت، برۆ با نۆشدەری بۆ بێت.

(کاپتن دەڕوات، یاوەری دەکەن)

(رۆز و ئەنگەس دێن)

(روو وەردەگێڕێت) ئەوە کێن دێن؟

**ماڵکۆڵم:** سەرداری هێژامان ئەوە رۆزە

**لینۆکس:** چ پەلەکردنێک لە چاوانییەوە دیارە،

ڕەنگە هەواڵی سەیری پێ بێت.

**رۆز:** خوا شامان بۆ بپارێزێت؟

**دەنکەن:** ئەی سەرداری هێژا لە کوێیەوە دێیت؟

**رۆز**: شای مەزن، لە ناوچەی (فایف)ەوە،

لەوێ ئالای نەروێجی گاڵتەی بە ئاسمانمان دەکرد و

هاووڵاتییەکانمانی سارد کردبۆوە

نەروێج بە پیاوی زۆرەوە و

بە پشتیوانی خایەنی هەرە ناپاک سەرداری (کۆدۆ)

جەنگێکی بێ ئامانی بەرپا کردبوو،

تا ماکبێسی زاوای (بیلۆنا)[١] بە زرێپۆشەوە هاتە مەیدان

قۆڵ بەقۆڵ و شمشێر بەرامبەر شمشێر

بەرامبەری کەوتە جەنگان و

بە ڕۆحە پڕ توورەییەکەی دەستی خۆی لێی وەشاند و

سەرەنجام سەرکەوتن بە ئێمە بڕا؛–

**دەنکەن:** چ شادییەکی مەزنە!

(١) بیلۆنا: خواوەندی شەڕی ڕۆمانەکانە

**ROSSE**:

That now
Sweno, the Norways' king, craves composition;
Nor would we deign him burial of his men
Till he disbursed, at Saint Colme's-Inch,
Ten thousand dollars to our general use.

**DUNCAN:**

No more that Thane of Cawdor shall deceive
Our bosom interest:--Go pronounce his present death,
And with his former title greet Macbeth.

**ROSS:**

I'll see it done.

**DUNCAN:**

What he hath lost, noble Macbeth hath won.

[Exeunt.]



**رۆز**: ئێستاش (سوینۆ)ی شای نەروێج
تامەزرۆی پێکهاتن و ئاشتییە،
ئێمەش لێ نەگەڕاین کوژراوەکانی بنێژێت
تا دە هەزار دۆلارمان لە (سانت کۆڵمز ئینچ)دا
بۆ خزمەتی گشتی پێ نەژمارد.

**دەنکەن:** ئەو سەردارەی (کۆدۆ) چی دی ناتوانێت
حەزی سینەمان لەخشتە ببات. – بڕۆ یەکسەر مەرگی رابگەیەنە
نازناوەکەشی بە ماکبێس رەوا ببینە ـ.

**رۆز:** بەخۆم چاودێری ئەوە دەکەم.

**دەنکەن:** هەرچی ئەو دۆڕاندی من بە (ماکبێس)ی دەدەم.

(دەڕۆن)

## Scene III

**A heath.**

*[Thunder. Enter the three Witches.]*

**FIRST WITCH:**

Where hast thou been, sister?

**SECOND WITCH:**

Killing swine.

**THIRD WITCH:**

Sister, where thou?

**FIRST WITCH:**

A sailor's wife had chestnuts in her lap,
And munched, and munched, and munched:--
"Give me," quoth I:
"Aroint thee, witch!" the rump-fed ronyon cries.
Her husband's to Aleppo gone, master o' the Tiger:
But in a sieve I'll thither sail,
And, like a rat without a tail,
I'll do, I'll do, and I'll do.

**SECOND WITCH:**

I'll give thee a wind.

**FIRST WITCH:**

Thou art kind.

**THIRD WITCH:**

And I another.

**FIRST WITCH:**

I myself have all the other:
And the very ports they blow,



## دیمەنی سێیەم

چۆلاییەک

گرمەیە، سێ جادووگەر دێن

**یەکەم جادووگەر:** خویشک لە کوێ بوون؟

**دووەم جادووگەر:** بەرازم دەکوژت.

**سێیەم جادووگەر:** خویشک، ئەدی بە خۆت؟

**یەکەم جادووگەر:** ژنە زەریاوانێک شابەڕووی کردبووە کۆشان
دەیکرماند و دەیکرماند و دەیکرماند،
پێم گۆت: «بمدەرێ»
ژنە پیسە خەپەکە قیژاندی: «هەڕە، ئەی جادووگەر!»
مێردەکەی بە کەشتییە پڵینگ ناوەکەی چۆتە حەڵەبێ
منیش وا بە سواری هێڵەنگێ
دەڕۆم وەک جورجی کلک قوندێ
هەر کەشتییەکەی دەخۆم و دەخۆم و دەخۆم.

**دووەم جادووگەر:** منیش (با)یەکت دەدەمێ.

**سێیەم جادووگەر:** منیش بایەکی دی.

**یەکەم جادووگەر:** منیش (با)ی دیکەم هەن
لەو بەندەرانەی هەڵ دەکەن

لەو پنتانەی کە کابرای دەریاوان
پێی دەزانێت لەسەر نەخشەی جوان.
بە چەشنی کا وشکی دەکەم
شەو و ڕۆژ لە خەوی دەکەم
نایەڵم خەو بچێتە پێڵووی چاوانی
تا دەژی نەفرەتکراوە بوون و مانی
حەوت شەوان، نۆ بە نۆ دەیڕەتێنم
تا لە خەفەتان دەتوێتەوە و دایدەڕزێنم.
گەرچی کەشتییەکەی ون نابێت
لەبەردەم زریانان دەبێ تێهەڵدرابێت.
دە بزانن چیم پێیە.

**دووەم جادووگەر**: پیشانم بدە، پیشانم بدە.

**یەکەم جادووگەر**: ئەوە کەڵەموستی کەشتیوانە
لە گەڕانەوەدا تێک شکاو کەسی نەگەیشتە هانا.
(لە ناوەوەی شانۆ دەنگی تەپڵ دێت)

**سێیەم جادووگەر:** تەپڵە تەپڵ وا دەنگی دێت!
ئەوە (ماکبێس)ە بۆ ئێرە دێت.

**هەموویان:** خوشکانی چارەنووس؛ تەتەری وشکانی و ئاوان
با دەست بخەینە ناو دەستان.
ئاوا دەگەڕێین و دەسووڕێین
سێ جار بەلای تۆ و سێش بە لای مندا دێین
سێ جاری دیش، تا دەگاتە نۆ
هێواش! – جادووەکە کارییە، هۆ.
(ماکبێس و بانکۆ دێن)

**ماکبێس:** بە بیرم نایەت ڕۆژێکی وا چاک و خراپم دیبێت.

**بانکۆ:** چەندی ماوە بگەینە فۆرس؟ (هەست بەجادووگەرەکان دەکات)



All the quarters that they know
I' the shipman's card.
I will drain him dry as hay:
Sleep shall neither night nor day
Hang upon his pent-house lid;
He shall live a man forbid.
Weary sev'n-nights nine times nine
Shall he dwindle, peak, and pine:
Though his bark cannot be lost,
Yet it shall be tempest-tost.--
Look what I have.

**SECOND WITCH:**
Show me, show me.

**FIRST WITCH.**
Here I have a pilot's thumb,
Wreck'd as homeward he did come.
*[Drum within.]*

**THIRD WITCH:**
A drum, a drum!
Macbeth doth come.

**ALL:**
The weird sisters, hand in hand,
Posters of the sea and land,
Thus do go about, about:
Thrice to thine, and thrice to mine,
And thrice again, to make up nine.
Peace!--the charm's wound up.
*[Enter Macbeth and Banquo.]*

**MACBETH:**
So foul and fair a day I have not seen.

**BANQUO:**
How far is't call'd to Forres? *[He notices the Witches]*

ئەوانە چین،
وا ڕەق و تەق لە بەرگی کێوییانەیاندان
هەر دەڵێی خەڵکی ئەو سەرزەمینە نین
کەچی وا لەسەریشی دەژین؟ (لەگەڵ جادووگەرەکان دەدوێ)
زیندوون؟ ئەرێ ئێوە ئەوەن مرۆڤ لە گەڵتان بدوێت؟
وا پێ دەچێت لێم تێ بگەن، بەڵام هەمووتان یەکسەر
پەنجە زبرەکانتان لەسەر لێوە چەرمینەکانتان داناوە:
دەبێ ئێوە ژن بن؛
کەچی لەبەر ردێنەکانتان ناتوانم
بڵێم ژنن.

**ماکبێس:** گەر دەتوانن بدوێن:– ئێوە چین؟

**یەکەم جادووگەر:** سلاو، سلاو لە تۆ ماکبێس، ئەی سەرداری گلێمیس!

**دووەم جادووگەر:** سلاو، سلاو لە تۆ ماکبێس، ئەی سەرداری کۆدۆ!

**سێیەم جادووگەر:** سلاو، سلاو لەتۆ ماکبێس، ئەی ئەوەی پاشتر دەبیتە شا.

**بانکۆ** (روو دەکاتە ماکبێس): گەورەی هێژا، چییە بۆ وا رادەچڵەکیت،
لە شتێکی هێندە خۆش وا دەترسیت؟
(بۆ جادووگەرەکان) توخوا پێم بڵێن
ئێوە خەیاڵن یان وەک پێ دەچن
ئەوە بن؟ ئێستا ئێوە بە شتی خۆش
سلاوتان لە هاوڕێ جوامێرەکەم کردو
پێشبینی شتی جوامێرانە و ئاواتی شاهانەتان بۆی کردو
وێدەچێ بەمەش نقوومی خەیاڵ بووبێ:
کەچی هیچتان بەمن نەگوت.
ئەگەر ئێوە لە دەنکە تۆوی رۆژگار بڕوانن
ڕواو و نەڕواو لێکدی هەڵ هاوێرن.
دەوجا بۆ من بدوێن کە نە بۆ چاکە لێتان دەپاڕێمەوە و
نە لە کینەشتان دەترسم.



What are these
So wither'd, and so wild in their attire,
That look not like th ' inhabitants o' the earth,
And yet are on't? *[He speaks to the witches]* Live you? or
are you aught That man may question? You seem to understand me,
By each at once her chappy finger laying
Upon her skinny lips: you should be women,
And yet your beards forbid me to interpret
That you are so.

**MACBETH:**
Speak, if you can;--what are you?

**FIRST WITCH:**
All hail, Macbeth! hail to thee, Thane of Glamis!

**SECOND WITCH:**
All hail, Macbeth! hail to thee, Thane of Cawdor!

**THIRD WITCH:**
All hail, Macbeth! that shalt be king hereafter!

**BANQUO:**
*[Turning to Macbeth]* Good sir, why do you start; and seem to fear
Things that do sound so fair? *[To the Witches]* I' the name of truth,
truth, Are ye fantastical, or that indeed
Which outwardly ye show? My noble partner
You greet with present grace and great prediction
Of noble having and of royal hope,
That he seems rapt withal: to me you speak not:
If you can look into the seeds of time,
And say which grain will grow, and which will not,
Speak then to me, who neither beg nor fear
Your favors nor your hate.

**یەکەم جادووگەر**: سلاو!

**دووەم جادووگەر**: سلاو!

**سێیەم جادووگەر**: سلاو!

**یەکەم جادووگەر**: نزمتر دەبیت لە ماکبێس بەڵام لەویش مەزنتری.

**دووەم جادووگەر**: زۆر بەختەوەر نابی، کەچی لەویش بەختەوەرتری.

**سێیەم جادووگەر**: شات لێ وەپاش دەکەوێت، هەرچەندە خۆت نابیتە شا،

جا سلاو، سلاو بۆ ماکبێس و بانکۆ !

**یەکەم جادووگەر**: سلاو، سلاو بانکۆ و ماکبێس.

**ماکبێس**: راوەستن قسەکەرانی ناتەواو، پترم پێ بڵێن.

به مەرگی (سینێڵ)[٢]ی باوکم دەزانم سەرداری (گلێمس)م؛

بەڵام چۆن دەبمە سەرداری (کۆدۆ)؟ سەرداری (کۆدۆ) وادەژیت و

جوامێرێکی پایەبەرزە، بوونیشم بە شا

بە هیچ ئەقڵێکدا ناچێ، وێڕای ئەوەی

ببمە سەرداری (کۆدۆ). بڵێن ئەو زانیارییانەتان

لە کوێ وەدەست هێناوە؟ یان بۆ لەو چۆلاییە خواگیرەدا

بەو سلاوە پر پێشبینییانەتان ڕێمان لێ دەگرن؟

قسە بکەن، فەرمانتان پێ دەکەم.

(جادووگەرەکان نامێنن)

**بانکۆ**: زەوی بڵقی هەیە وەک ئاو

ئەوانەش بڵقی ئەون – چوونە کوێ؟

(٢) سینێڵ: سەرداری جارانی گلێمس و باوکی ماکبێس بووە.



**FIRST WITCH:**

Hail!

**SECOND WITCH:**

Hail!

**THIRD WITCH:**

Hail!

**FIRST WITCH:**

Lesser than Macbeth, and greater.

**SECOND WITCH:**

Not so happy, yet much happier.

**THIRD WITCH:**

Thou shalt get kings, though thou be none:
So all hail, Macbeth and Banquo!

**FIRST WITCH:**

Banquo and Macbeth, all hail!

**MACBETH:**

Stay, you imperfect speakers, tell me more.
By Sinel's death, I know I am Thane of Glamis;
But how of Cawdor? The Thane of Cawdor lives,
A prosperous gentleman; and to be king
Stands not within the prospect of belief,
No more than to be Cawdor. Say from whence
You owe this strange intelligence? or why
Upon this blasted heath you stop our way
With such prophetic greeting?--Speak, I charge you.
[Witches vanish.]

**BANQUO:**

The earth hath bubbles, as the water has,
And these are of them:--Whither are they vanished?

**ماکبێس:** بە هەوادا چوون؛ ئەوەی تەندار دەردەکەوت،

وەک هەناسە لە هەوادا توایەوە– خۆزگە بمابانەوە.

**بانکۆ:** ئەرێ ئەو شتانەی لێی دەدوێین هەبوون،

یان ڕەگی گیای مرۆڤ شێتکەرمان خواردووە

کە مێشکمان دیل دەکات؟

**ماکبێس:** ڕۆڵەکانت دەبن بە شا.

**بانکۆ:** تۆ خۆت دەبیت بە شا.

**ماکبێس:** سەرداری (کۆدۆ)ش، وانەبوو؟

**بانکۆ:** هەر بە هەمان وشە و ئاوازەشەوە. کێ لەوێیە؟

(ڕۆز و ئەنگەس دێنە ژوور)

**ڕۆز:** شا بە دڵخۆشییەوە هەواڵی سەرکەوتنی

تۆی پێ گەییوە، ماکبێس. جا کاتێک

کارو کردەی تۆ لە شەڕی یاخییاندا دەخوێنێتەوە

سەرسوڕمانی لە کردارەکانت و ستایشەکانی بۆ تۆ

لە زۆرانبازیدان و نازانێ کامیان بۆ تۆن و کامیان بۆ خۆیەتی،

بۆیەش زمانی گۆناکا و هەر هەمان ڕۆژ کە ورد دەبێتەوە

تۆ لەناو ڕیزی نەروێجییە پڕ هێزەکاندا دەبینێت و

لە هیچی خۆت ناترسیت و لە وێنەی مەرگ و کوشتار

ناسڵەمیتەوە. هەواڵهێن پۆستە پۆستە وەک

تەزرە دێن و ستایشی بەرگریکردنی

بێ وێنەی تۆ لە شانشینەکەمان

لە بەردەمی شا هەڵدەڕێژن.



**MACBETH:**

Into the air; and what seemed corporal melted

As breath into the wind.--Would they had stayed!

**BANQUO:**

Were such things here as we do speak about?

Or have we eaten on the insane root

That takes the reason prisoner?

**MACBETH:**

Your children shall be kings

**BANQUO:**

You shall be king.

**MACBETH:**

And Thane of Cawdor too; went it not so?

**BANQUO:**

To the selfsame tune and words. Who's here?

*[Enter Rosse and Angus.]*

**ROSSE:**

The king hath happily received, Macbeth,

The news of thy success: and, when he reads

Thy personal venture in the rebels' fight,

His wonders and his praises do contend

Which should be thine or his. Silenced with that,

In viewing o'er the rest o' the self-same day,

He finds thee in the stout Norweyan ranks,

Nothing afeard of what thyself didst make,

Strange images of death. As thick as hail

Came post with post; and every one did bear

Thy praises in his kingdom's great defense,

And pour'd them down before him.

**ئەنگەس:** ئێمە نێردراوین

تاوەکو سوپاسی شای سەروەرمانت پێ ڕابگەیەنین؛

تا بارەگای مەزنی لە گەڵتابین

نەک ئێوە ئەرک بکێشن.

**رۆز:** هەروەها وەک پێشەکی ڕێزلێنانێکی گەورەتر

فەرمانی پێ داوم کە سەرباری نازناوی خۆت

بە سەرداری (کۆدۆ)ش بانگت بکەم.

سڵاو، ئەی سەرداری هەرە هێژا، سڵاو.

**بانکۆ:** چی! دەشێ شەیتان ڕاست بڵێت؟

**ماکبێس:** سەرداری (کۆدۆ) ماوە و دەژیت،

بۆ جلکی خەڵکیم بە بەردا دەکەیت؟

**ئەنگەس:** ئەوەی جاران سەردار بوو هێشتا دەژیت!

بەڵام ئەو ژیانەی ماویەتی و شایەنە لە دەستی بدات

لە ژێر فەرمانی مەرگدایە، جا نازانم ئاخۆ بەگەڵ

نەروێجییان کەوتووە یان چۆتە پاڵ یاخییان و

بە دزی یارمەتی و سوودی پێ گەیاندوون، یان لەگەڵ

هەردوولادا بووە، ئەو کاری بۆ ڕووخانی وڵاتەکەی کردووە،

ناپاکی مەزنی دانپیانراو و چەسپاوی لەسەرەو

ئەمەش سەرنگوونی کردووە.

**ماکبێس:** (لەلاوە) گلێمیس و سەرداری (کۆدۆ)

مەزنتریش بەدواوەیە.

(بۆ رۆز و ئەنگەس) سوپاسی ماندووبوونتان دەکەم.

(بۆ بانکۆ) بە تەما نیت ڕۆڵەکانت ببنە پاشا

لە کاتێکدا ئەوانەی سەرداری (کۆدۆ)یان بەمن بەخشی

بەڵێنی کەمتریان بەوان نەدا؟



**ANGUS:**

We are sent
To give thee, from our royal master, thanks;
Only to herald thee into his sight,
Not pay thee.

**ROSSE:**

And, for an earnest of a greater honor,
He bade me, from him, call thee Thane of Cawdor:
In which addition, Hail, most worthy thane,
For it is thine.

**BANQUO:**

What! can the devil speak true?

**MACBETH:**

The Thane of Cawdor lives: why do you dress me
In borrowed robes?

**ANGUS:**

Who was the Thane lives yet;
But under heavy judgement bears that life
Which he deserves to lose. Whether he was combined
With those of Norway, or did line the rebel
With hidden help and vantage, or that with both
He laboured in his country's wreck, I know not;
But treasons capital, confessed and proved,
Have overthrown him.

**MACBETH:**

*[Aside.]* Glamis, and Thane of Cawdor:
The greatest is behind.
*[To Rosse and Angus]* Thanks for your pains.--
*[To Banquo]* Do you not hope your children shall be kings,
When those that gave the Thane of Cawdor to me
Promised no less to them?

**بانكۆ:** ئەگەر تا سەر بڕوای پێ بکەیت
ڕەنگە هێشتا بەرەو تانجەکە گڕی تامەزرۆییت بەهێز بکات
وێڕای بوون بە سەرداری (کۆدۆ)ش. بەڵام سەیرە
ئەو بوونەوەرانەی تاریکی زۆرجار ڕاستیمان پێ دەڵێن
بۆ ئەوەی بە دۆڕانمان بدەن و ئازارمان پێ بگەیەنن،
بە فشە و شتی بێ بایەخ دەمانبەنەوە
تا لە شتی هەرە گرینگ بمانخلەتێنن –
(بۆ رۆز و ئەنگەس) ئامۆزاکانم، تکایە قسەیەکم لەگەڵتان هەیە.
**ماکبێس:** (لەلاوە) دوو ڕاستی گوتران
وەک پێشەکییەکی خۆش بۆ دیمەنێکی گەشەسەندووی
گەیشتن بە شاهێتی
(بۆ رۆز و ئەنگەس) جوامێران، سوپاس –
(لەلاوە) ئەم داوا سەرسروشتییە
نەدەبێ خراپ بێت و نەدەبێ چاک، – ئەگەر خراپ بێ،
بۆچ پێشەکی سەرکەوتنی پێم بەخشی و
بە ڕاستی دەستی پێ کرد؟ وا ئێستا من سەرداری (کۆدۆ)م:
ئەگەر چاک بێت، بۆ وا ئەو خەیاڵانە بە مێشکم دادێن
کە وێنەی ترسناکیان پرچم قیت دەوەستێنن و
وا لە دڵم دەکات لە ناو پەراسووم‌دا بکەوێتە کوتەکوت
لە دژی کردنی کارێکی وای دژ بە سروشت؟
ترسەکانی ئێستا کەمترن لە بیر و ئەندێشەی زراوبەر.
تا ئێستا بیری کوشتن لە ناو مێشکما شتێکی خەیاڵییە،
لە باڵەخانەی خەیاڵما گیرە و لەلای من هیچ شتێک
ڕاست نییە جگە لەو شتانەی بە ڕاستی نین.
**بانكۆ:** (بۆ گەورەپیاوان) بڕوانن، چۆن هاوڕێمان خەیاڵ بردوویەتیەوە.



**BANQUO:**

That, trusted home,
Might yet enkindle you unto the crown,
Besides the Thane of Cawdor. But 'tis strange:
And oftentimes to win us to our harm,
The instruments of darkness tell us truths;
*[To Rosse and Angus]* Win us with honest trifles, to betray's
In deepest consequence.--
Cousins, a word, I pray you.

**MACBETH:**

*[Aside.]* Two truths are told,
As happy prologues to the swelling act
*Of the imperial theme.*
*[To Rosse and Angus]* I thank you, gentlemen.--
*[Aside.]* This supernatural soliciting
Cannot be ill; cannot be good:--if ill,
Why hath it given me earnest of success,
Commencing in a truth? I am Thane of Cawdor:
If good, why do I yield to that suggestion
Whose horrid image doth unfix my hair,
And make my seated heart knock at my ribs,
Against the use of nature? Present fears
Are less than horrible imaginings:
My thought, whose murder yet is but fantastical,
Shakes so my single state of man, that function
Is smothered in surmise; and nothing is
But what is not.

**BANQUO:**

*[To the Lords]* Look, how our partner's rapt.

**MACBETH:**

*[Aside.]* If chance will have me king, why, chance may crown me
Without my stir.

**BANQUO:**

New honors come upon him,
Like our strange garments, cleave not to their mould
But with the aid of use.

**MACBETH:**

[*Aside*.] Come what come may,
Time and the hour runs through the roughest day.

**BANQUO:**

Worthy Macbeth, we stay upon your leisure.

**MACBETH:**

*[To the Lords]* Give me your favor:--my dull brain was wrought
With things forgotten. Kind gentlemen, your pains
Are registered where every day I turn
The leaf to read them.--Let us toward the king.--
[*To Banquo*] Think upon what hath chanced; and, at more time,
The interim having weighed it, let us speak
Our free hearts each to other.

**BANQUO:**

Very gladly.

**MACBETH:**

Till then, enough. *[To All]* Come, friends.

[Exeunt.]



**ماکبێس:** (لەلاوە) ئەگەر چارەنووس دەیەوێت من ببمە شا،
خۆ دەتوانێت بە بێ هیچ هەوڵێکی خۆم تاجەکەم لەسەر بنێت.
**بانکۆ:** نازناوی نوێ دەڵێی جلی سەیرن
دەکرێنە بەری و
تەنها دوای بەکارهێنانیان لێی دێن.
**ماکبێس:** (لەلاوە) هەرچی دەبێ بابێ،
کات و سات بە ڕۆژگارێکی تەنگدا ڕەت دەبێ.
**بانکۆ:** (ماکبێس)ی هێژا، ئێمە چاوەڕێی تۆین.
**ماکبێس:** (بۆ گەورە پیاوان) بمبوورن، مێشکی حەپۆڵم
بەشتی ترەوە خەریکە و ئێوەی لە بیرچۆتەوە،
جوامێرانی دلۆڤان، ماندووبوونتان رۆژ بەڕۆژ نووسراون و
هەموو ڕۆژێک پەڕەیەکی لێ دەخوێنمەوە - با بچینە لای پاشا-
(بۆ بانکۆ) بیر لەو شتەی چارەنووس هێنای بکەوە،
دوایی چاک لێی ورد بەرەوە و ئینجا
بێ پێچ و پەنا رازی دڵمان پێک دەڵێین.
**بانکۆ:** زۆرم پێ خۆشە.
**ماکبێس:** تا ئەوکات، بەسە! (بۆ هەمووان) هاوڕێیان با بڕۆین.
(دەڕۆن)

## Scene IV

**Forres. A Room in the king’s Palace.**

*[Flourish of trumpets.*

*Enter Duncan, Malcolm, Donalbain, Lennox, and Attendants.]*

**DUNCAN:**

Is execution done on Cawdor? Are not
Those in commission yet returned?

**MALCOLM:**

My liege,
They are not yet come back. But I have spoke
With one that saw him die: who did report,
That very frankly he confess'd his treasons;
Implored your highness' pardon; and set forth
A deep repentance. Nothing in his life
Became him like the leaving it; he died
As one that had been studied in his death,
To throw away the dearest thing he owed
As 'twere a careless trifle.

**DUNCAN:**

There's no art
To find the mind's construction in the face:
He was a gentleman on whom I built
An absolute trust.--
*[Enter Macbeth, Banquo, Rosse, and Angus.]*
*[To Macbeth]* O worthiest cousin!



## دیمەنی چوارەم

فۆرێس، ژوورێک لە کۆشکی شادا

نوورەی کەڕەنا دێت.

دەنکەن و ماڵکۆڵم، دۆناڵبێن، لینۆکس و یاوەران دێن.

**دەنکەن:** داخۆ (کۆدۆ) لە سێدارە دراوە؟
ئاخۆ ئەوانەی ئەو کارەیان پێ سپێررابوو نەگەڕاونەتەوە؟

**ماڵکۆڵم:** گەورەم، هێشتا نەهاتوونەتەوە؛
بەڵام لەگەڵ یەکێک دوام
کە لە سەرەمەرگدا بینیبووی، پێی گوتم
ئەو بێ پێچ و پەنا دانی بە خیانەتەکەی ناوە،
داوای لێبووردنیشی لە ئێوەی خاوەن شکۆ کردووە.
هەروەها زۆر پەشیمانی پیشان دابوو. هیچ شتێک
لە ژیانیدا وەک ئەو مردنە لێی نەوەشاوەتەوە:
ئەو وەک یەکێک مرد کە مردنی خۆی خوێندبێتەوە
تاکو گرنگترین شتی خۆی
وەک شتێکی بێ بایەخ فڕێ بدات.

**دەنکەن:** هیچ هونەرێک نییە
بتوانێت بیری مێشکی مرۆڤ لە دەموچاوی بخوێنێتەوە[٣]:
ئەو جوامێرێک بوو
کە من بڕوای تەواوم پێی بوو–
(ماکبێس، بانکۆ، رۆز و ئەنگەس دێنە ژوور)
(بۆ ماکبێس) ئەی ئامۆزای هێژام!

(٣) ئەم قسەیە بە هاتنە ژوورەوەی (ماکبێس) بەراوپێچ دەبێتەوە.

گوناهی ناسوپاسمەندیم تا ئێستا
لەسەرم بارە. تۆ زۆر لە پێشیت و
باڵی خێرای  پاداشت زۆر خاوەو
پێت ناگات: ئەگەر کەمتر شایستە بایت،
رادەی سوپاس و پاداشتم
یەکسان دەبوون! هەر ئەوەم بۆ ماوەتەوە بڵێم
شایەنی پتریت لەوەی پێت دەدرێت.

**ماکبێس:** ئەو خزمەت و دڵسۆزییەی هەمە،
بەکردنیان خۆی قەرزی خۆی دەداتەوە
ڕۆڵی بەرێزتان ئەوەیە ئەرکەکانمان لێ وەربگرن:
ئەرکی ئێمەش لەپێناو تەخت و وڵات و منداڵ و خزمەتکارانتە:
ئەوەی پێویستە بیانکەین، بە کردنیان
خۆشەویستی و رۆمەتتان دەپارێزن.

**دەنکەن:** بەخێر بێیت:
من تۆم چاندووە و هەوڵ دەدەم
بە تەواوی پێت بگەیەنم (بۆ بانکۆ)- بانکۆی شکۆمەند
کە لەو ناشایستەتر نییەو نابێ واش بزانین
کەمتری کردووە، رێم بدە لە باوەشت بگرم و
لە تەک دڵمەوە رات بگرم.

**بانکۆ:** ئەگەر لەوێ پێ بگەم
بەرەکەی بۆ خۆتە.

**دەنکەن:** شادیم لەوە بەدەرە
پێم بەرزەفت بێت؛ بۆیە لە دڵۆپی خەماندا
خۆی دەردەبڕێت (بۆ هەمووان) ڕۆڵەکانم،
خزمانم، سەردارانم، ئەوانەی لێم نزیکن، بزانن
ئێمە لە داهاتوودا دەوڵەتمان دەخەینە ئەستۆی



The sin of my ingratitude even now
Was heavy on me. Thou art so far before,
That swiftest wing of recompense is slow
To overtake thee. Would thou hadst less deserved;
That the proportion both of thanks and payment
Might have been mine! only I have left to say,
More is thy due than more than all can pay.

**MACBETH:**
The service and the loyalty I owe,
In doing it, pays itself. Your highness' part
Is to receive our duties: and our duties
Are to your throne and state, children and servants;
Which do but what they should, by doing everything
Safe toward your love and honor.

**DUNCAN:**
Welcome hither:
I have begun to plant thee, and will labor
To make thee full of growing.
*[To Banquo]* Noble Banquo,
That hast no less deserved, nor must be known
No less to have done so,let me infold thee
And hold thee to my heart.

**BANQUO:**
There if I grow,
The harvest is your own.

**DUNCAN:**
My plenteous joys,
Wanton in fulness, seek to hide themselves
In drops of sorrow. *[To All]* Sons, kinsmen, thanes,
And you whose places are the nearest, know,
We will establish our estate upon

(ماڵکۆڵم)ی کوڕە گەورەمان؛ لەمەودواش
دەیکەینە شازادەی ناوچەی (کەمبەرلاند): ئەم شەرەفە
نابێ بە تەنیا ئەو پێ بگەیەنێت،
بەڵکو نیشانەی جوامێری وەکو ئەستێرە
بەسەر هەموو کەسێکی شایستە دەدرەوشێتەوە–
(بۆ ماکبێس) هەر لێرەوەڕا دێینە (ئینڤرەنیس)
تا پەیوەندیمان بە تێنتر بێت!

**ماکبێس:** تەنها ئەوەی لە خزمەتی بەڕێزتاندا نییە، ئەرکە.
هەر بەخۆم دەبمە پەیامبەر و گوێی خێزانەکەم
خۆش دەکەم بەهاتنتان؛
بۆیە زۆر بە خاکەڕایی داوا دەکەم ڕێم بدەیت بڕۆم.

**دەنکەن:** ئەی (کۆدۆ)ی هێژام!

**ماکبێس:** (لەلاوە) شازادەی (کەمبەرلاند)!– ئەمە کۆسپێکە
لەسەر ڕێم، یان دەبێ ساتمەی لێ بکەم یان لەسەری پاز بدەم
چونکە لەسەر ڕێمە. ئەستێران، ڕووناکیتان وەشارن!
با ڕووناکی ئارەزووە قووڵ و ڕەشەکانم نە ئاشکارن،
با چاو دەست نەبینێت، هێشتاش ئەوەی چاو
لێی دەترسێت بابێ و ئەوسا ئەوەی بووە با بیبینێت.

**دەنکەن:** بانکۆی هێژا، ڕاستە ئەو گەلێ ئازایە
لە چاکە و مەردایەتی ئەو من تێرم؛
ئەو داوەتە گۆڤەندێکە بۆ من. با لە دوای بڕۆین،
ئەو بە خۆی بە پێشمان کەوت و ئەرکی
پێشوازیکردنی گرتە ئەستۆ: ئەو خزمێکی بێ هاوتایە.
(تەپڵکوتانی ڕۆیشتن)



Our eldest, Malcolm; whom we name hereafter
The Prince of Cumberland: which honor must
Not unaccompanied invest him only,
But signs of nobleness, like stars, shall shine
On all deservers. *[To Macbeth]* From hence to Inverness,
And bind us further to you.

**MACBETH:**
The rest is labour, which is not used for you:
I'll be myself the harbinger, and make joyful
The hearing of my wife with your approach;
So, humbly take my leave.

**DUNCAN:**
My worthy Cawdor!

**MACBETH:**
*[Aside.]* The Prince of Cumberland!--That is a step,
On which I must fall down, or else o'erleap,
For in my way it lies. Stars, hide your fires!
Let not light see my black and deep desires:
The eye wink at the hand! yet let that be,
Which the eye fears, when it is done, to see.
*[Exit.]*

**DUNCAN:**
True, worthy Banquo! he is full so valiant,
And in his commendations I am fed;
It is a banquet to me. Let us after him,
Whose care is gone before to bid us welcome:
It is a peerless kinsman.
*[Flourish. Exeunt.]*

# دیمەنی پێنجەم

## ئێنڤەرنێس، ژوورێک لە قەڵای ماکبێس

خاتوو ماکبێس دێتە ژوور نامەیەک دەخوێنێتەوە.

**خاتوو ماکبێس:** «رۆژی سەرکەوتن منیان بینی؛ لە سەرچاوەیەکی یەکجار تەواوەوە دڵنیام ئەوان زانیارییان لە مرۆڤ پترە، هەرکە ئارەزووی پتر زانین دەیسووتاندم، ئەوان خۆیان کردە هەواو لە ناوی ون بوون. وەختێ من لە سەرسوڕماندا هێڵ ببوومەوە، پەیامهێن لەلایەن پادشاوە هاتن و هەموویان سڵاویان بە(سەرداری کۆدۆ) لێ کردم کە پێشتر خوشکانی چارەنووس بەو ناوە سڵاویان لێ کردبووم و ئە ئاوا سڵاویان لێ کردم (سڵاو ئەی ئەوەی پاشتر دەبیتە شا!) وام بە باش زانی  ئەوەت پێ رابگەیەنم، ئەی هاوبەشی مەزنیم، تا لە خۆشی ئەو گەورەیییەی کە چاوەڕێی تۆش دەکات بێ بەش نەبیت. ئەمە با لە دڵی خۆت بێت، خوا حافیز».

تۆ گلێمس و کۆدۆیت: پاشتریش

دەبیتە ئەوەی بەڵێنت پێ دراوە – بەڵام لە سروشتت دەترسم:

پڕی دڵۆپە شیری بەزەیی مرۆڤانەیە و ڕەنگە

ڕێی نزیک نەگریتەبەر. تۆ حەز دەکەیت مەزن بیت و

لەمە بێ ئارەزوونیت، بەڵام ئەوەندە بەد نیت وابکەیت:

دەتەوێت بە ڕێگایەکی ڕەوا بەرز بیتەوە، کاری چەوت ناکەیت،

بەڵام دەتەوێت بە چەوتییەکە بگەیت: ئەی (گلێمس)ی مەزن

دەبوایە ئەو ویستەت هەبوایە کە دەینەڕاند: (ئەگەر بتەوێت، دەبێ وابکەیت.)

تۆ پتر لەو کارەی دەتەوێت بیکەیت دەترسیت

دەترسیت نەک لەو ئارەزووەی دەتەوێت نەکرێت.



# Scene V

**Inverness. A Room in Macbeth's Castle.**

*[Enter Lady Macbeth, reading a letter.]*

**LADY MACBETH:**

"They met me in the day of success; and I have learnt by
the perfect'st report they have more in them than mortal
knowledge. When I burned in desire to question them further,
they made themselves air, into which they vanished. Whiles
I stood rapt in the wonder of it, came missives from the king,
who all-hailed me, 'Thane of Cawdor'; by which title, before,
these weird sisters saluted me, and referred me to the coming
on of time, with 'Hail, king that shalt be!' This have I thought
good to deliver thee, my dearest partner of greatness; that
thou mightst not lose the dues of rejoicing, by being
ignorant of what greatness is promised thee. Lay it to thy heart,
and farewell."

Glamis thou art, and Cawdor; and shalt be
What thou art promised; yet do I fear thy nature;
It is too full o' the milk of human kindness
To catch the nearest way: thou wouldst be great;
Art not without ambition; but without
The illness should attend it: what thou wouldst highly,
That wouldst thou holily; wouldst not play false,
And yet wouldst wrongly win: thou 'dst have, great Glamis,
That which cries, "Thus thou must do, if thou have it:"
And that which rather thou dost fear to do
Than wishest should be undone. Hie thee hither,

ده وەرەوە ئێرە، ئەوسا من ڕۆحی خۆم دادەچۆڕێنمە ناو گوێت،
بە ئازایی زمانم سەرشکێنی هەموو ئەو شتانە دەکەم
کە دەبنە کۆسپ و ئاستەنگ لە ڕێگەی گەیشتن بە تاجی زێڕین،
کە دیارە چارەنووس و یاریدەی میتافیزیکی
دەیانەوێت لە سەرت بنێن.
(پەیامبەرێک دێت)
چ هەواڵێکت پێیە؟
**پەیامهێن:** ئەمشەو شا دێتە ئێرە.
**خاتوو ماکبێس:** شێت بووی شتی وا دەڵێی!
سەردارت لەگەڵیدا نییە؟ گەر وابوایە
پێی دەگوتم خۆ ئامادە بکەم.
**پەیامهێن:** بمبوورە ئەگەر بڵێم ڕاستە: سەردارمان بەڕێوەیە:
هاوڕێیەکم کە هەناسەی لێ بڕابوو
لەو بە تاوتر هات و
هەر ئەوەندەی پێ گوترا  ئەو هەواڵەم پێ بڵێت.
**خاتوو ماکبێس:** ئاگاتان لێی بێت،
هەواڵێکی گرنگی هێناوە (پەیامهێن دەڕوات).
قغەی ئەو قەلەڕەشە گڕە کە هاتنی مردەنی (دەنکەن)
بۆ ژێر باجەمان دەقرێنێت.
وەرن ئەی ئەو گیانانەی بیری مەرگ دێنن،
هەر لێرە ڕەگەزم بگۆڕن و لە تەوقی سەرم تا بنی پێم،
پڕ بکەن لە ترسناکترین دڵڕەقی! خوێنم پەیت بکەن،
ڕێگای پەشیمانیم لێ بگرن:
تا هیچ جۆرە ئازارێکی  ویژدان سەرم تێ نەکات و
پلانی دڕندانەم نەلەرزێنێت، ناشمەوێت ئاشتی بکەوێتە نێوان



That I may pour my spirits in thine ear;
And chastise with the valor of my tongue
All that impedes thee from the golden round,
Which fate and metaphysical aid doth seem
To have thee crown'd withal.-
*[Enter a Messenger.]*
What is your tidings?

**MESSENGER:**
The king comes here tonight.

**LADY MACBETH:**
Thou'rt mad to say it:
Is not thy master with him? who, were 't so,
Would have informed for preparation.

**MESSENGER:**
So please you, it is true: our thane is coming:
One of my fellows had the speed of him;
Who, almost dead for breath, had scarcely more
Than would make up his message.

**LADY MACBETH:**
Give him tending;
He brings great news.
*[Exit Messenger.]* The raven himself is hoarse
That croaks the fatal entrance of Duncan
Under my battlements. Come, you spirits
That tend on mortal thoughts, unsex me here,
And fill me, from the crown to the toe, top-full
Of direst cruelty! make thick my blood,
Stop up th ' access and passage to remorse,
That no compunctious visitings of nature
Shake my fell purpose, nor keep peace between

ئەنجام و پلانەکەم! ئەی فریشتەی مەرگ
وەرنە ناوسینگی ژنانەم و شیرم بکەنە زەرداو؛
بوونی نادیارتان لە هەرکوێ بێت
چاو دەدەنە بەدڕەفتاری سروشت! وەرە ئەی شەوی ئەستوور،
خۆت لە تاریکترین چڕەدووکەڵی دۆزەخ بپێچەوە،
تا چەقۆی تیژم ئەو برینانەی دەیانکات نەبینێت،
نەبادا ئاسمان لە پەنای ئەو سەرپۆشە تاریکانەدا لێم بڕوانێت و
هاوار بکات: (ڕاوەستە، ڕاوەستە!)

(ماکبێس دێتە ژوور)

(گلێمس)ی مەزن! (کۆدۆ)ی هێژا!
ئەی خاوەنی ئەوەی کە بە سڵاوی داهاتووت مەزنتر دەبێت!
نامەکانت لەوساتە فەرامۆشکراوەی ئێستادا
هەڵیانگرتم و من وا هەستدەکەم کە
داهاتوو لەو ساتەدا دەبینم.

**ماکبێس:** دولبەری ئازیز،
ئەمشەو (دەنکەن) دێتە ئێرە.

**خاتوو ماکبێس:** کەی دەڕوات؟

**ماکبێس:** نیازی وایە، سبەینێ؟

**خاتوو ماکبێس:** ئاهـ! هەرگیز
ڕۆژی ئەو سبەیە نابینێت!
سەرداری گەورەم، ڕوخسارت کتێبێکە
ڕەنگە مرۆڤ بابەتی سەیری لێ بخوێنێتەوە. بتەوێ ڕۆژگار
بخڵەتێنیت، وەک ڕۆژگار خۆت بنوێنە.
بە چاو و دەست و زمانت بە خێری بهێنە و
وەک گوڵێکی بێ زیان بە، بەڵام ماری ژێر پەلکان بە.
ئەوەی دێت پێویستە خۆی بۆ ئامادە بکرێت، تۆش



Th ' effect and it! Come to my woman's breasts,
And take my milk for gall, your murdering ministers,
Wherever in your sightless substances
You wait on nature's mischief! Come, thick night,
And pall thee in the dunnest smoke of hell
That my keen knife see not the wound it makes
Nor heaven peep through the blanket of the dark
To cry, "Hold, hold!"

*[Enter Macbeth.]*

Great Glamis! Worthy Cawdor!
Greater than both, by the all-hail hereafter!
Thy letters have transported me beyond
This ignorant present, and I feel now
The future in the instant.

**MACBETH:**
My dearest love,
Duncan comes here tonight.

**LADY MACBETH:**
And when goes hence?

**MACBETH:**
To-morrow, as he purposes.

**LADY MACBETH:**
O, never
Shall sun that morrow see!
Your face, my thane, is as a book where men
May read strange matters. To beguile the time,
Look like the time, bear welcome in your eye,
Your hand, your tongue: look like the innocent flower,
But be the serpent under't. He that's coming
Must be provided for: and you shall put

This night's great business into my despatch;
Which shall to all our nights and days to come
Give solely sovereign sway and masterdom.

**MACBETH:**

We will speak further.

**LADY MACBETH:**

Only look up clear;
To alter favor ever is to fear:
Leave all the rest to me.

[Exeunt.]



دەبێ ئەرکی ئەم شەو بە من بسپێریت؛
هەرئەوەشە کە لە رۆژگار و شەوگاری داهاتوودا
دەسەڵاتمان پێ دەبەخشێت.

**ماکبێس:** دوایی زێتر لەوە دەدوێین.

**خاتوو ماکبێس:** بەس ڕووخۆش بە،
ڕوخسار گۆڕان مانای ترسانە،
ئەوی دی بۆ من لێ بگەڕێ.

(دەڕۆن)

## Scene VI

**The same. Before the Castle.**

**[Hautboys and Torches.]**

*[Enter Duncan, Malcolm, Donalbain, Banquo, Lennox, Macduff, Rosse,Angus, and Attendants.]*

**DUNCAN:**

This castle hath a pleasant seat: the air
Nimbly and sweetly recommends itself
Unto our gentle senses.

**BANQUO:**

This guest of summer,
The temple-haunting martlet, does approve
By his lov'd mansionry, that the heaven's breath
Smells wooingly here: no jutty, frieze, buttress,
Nor coigne of vantage, but this bird hath made
His pendant bed and procreant cradle:
Where they most breed and haunt, I have observed
The air is delicate.

*[Enter Lady Macbeth.]*

**DUNCAN:**

See, see, our honour'd hostess-
*[To Lady Macbeth]* The love that follows us sometime is our trouble,
Which still we thank as love. Herein I teach you
How you shall bid God yield us for your pains,



## دیمەنی شەشەم

هەمان شوێن. بەردەمی قەڵا

دووزەلە و مەشخەڵ بە دەست دێن و دەچن.
دەنکەن، مالکۆڵم، دۆناڵبێن، بانکۆ، لینۆکس، ماکدەف، رۆز و ئەنگەس و یاوەرانی دێن.

**دەنکەن:** ئەو قەڵایە شوێنێکی خۆشی هەیە:
هەواکەی زۆر خۆش و نەرم
دێتە بەر هەستی ناسکمان.

**بانکۆ:** ئەو پەرەسێلکە پەرستگانشینە –
ئەو میوانەی هاوینێ بە هێلانە نازدارەکەیەوە
دیارە کە هەناسەی ئاسمان
بە خۆشی لێرەوە دێت: لێرە، نە هیچ پاسارێکی زەق و
نەپاڵەوانە و نەسووچێکی ئەو خانووە،
بۆ هێلانە هەڵواسراوەکەی ئەو باڵندەیە لەبار نییە و
بەو لانکە بزۆکەی وا هەست دەکەم
ئەو جێیەی ئەوانی لێ بن و سەردانی بکەن
هەواکەی نەرم و ناسکە.
(خاتوو ماکبێس دێت)

**دەنکەن:** ببینن! خانەخوێی پایەبەرزمان ببینن –
(بۆ خاتوو ماکبێس) خۆشەویستی دڵمان هەندێ جار دەبێتە کێشە بۆ خۆمان؛
کەچی هێشتاش هەر سوپاسمەندی میهرەبانیتین.
لەوەشەوە فێر دەبیت چۆن داوا لە خوا بکەیت
پاداشتی ئەو ناخۆشییەمان بداتەوە،

لەبەر ئەوەش ستایشمان بکەیت.

**خاتوو ماکبێس:** ئەگەر هەموو خزمەتێکمان

له هەموو لایەنێکەوە دوو ئەوەندە بێ و پاشتر دووقات بکرێتەوە

هێشتاش کەم و بێ توانایە لە بەرامبەر ئەو سەربەرزییە

گەورەو مەزنەی بەڕێزتان بە هاتنتان ماڵەکەمانی لێ پڕکردووە:

بۆ ئەو پایە بەرزییەی ئەوسا و ئێستا

کە پێت بەخشیون، نوێژت بۆ دەکەین.

**دەنکەن:** سەرداری (کۆدۆ) لە کوێیە؟

ئێمە بە شوێن پێیەوە بووین، نیازمان بوو

ببینە پێشقەرەوڵی، بەڵام ئەو باش دەڕۆیشت؛

خۆشەویستی مەزنی، بەقەد زەختەکەی تیژبووو

ئەوی پێش ئێمە گەیاندە ماڵ، ئەی خانەخوێی جوان و چاکەخواز،

ئیمشەو ئێمە میوانتانین.

**خاتوو ماکبێس:** هەتاهەتایە خزمەتکارتین،

هەموو خزمەتکاران و خۆیان و هەموو شتێکیان

هی تۆیە، ئەوان ئامادەن تۆماری خۆیان بخەنە ژێردەستت و

ماڵی خۆت بە خۆت بدەنەوە.

**دەنکەن:** دەستتم بدەرێ؛

بمبە لای خانەخوێی خۆم: ئێمە ئەومان زۆر خۆشدەوێ و

لە بەخششی خۆمان بەردەوام دەبین.

ڕێم بدە بیبینم ئەی خانەخوێ.

(دەڕۆن)



And thank us for your trouble.

**LADY MACBETH:**

All our service
In every point twice done, and then done double,
Were poor and single business to contend
Against those honours deep and broad wherewith
Your majesty loads our house: for those of old,
And the late dignities heaped up to them,
We rest your hermits.

**DUNCAN:**

Where's the Thane of Cawdor?
We cours'd him at the heels, and had a purpose
To be his purveyor: but he rides well;
And his great love, sharp as his spur, hath holp him
To his home before us. Fair and noble hostess,
We are your guest tonight.

**LADY MACBETH:**

Your servants ever
Have theirs, themselves, and what is theirs, in compt,
To make their audit at your highness' pleasure,
Still to return your own.

**DUNCAN:**

Give me your hand;
Conduct me to mine host: we love him highly,
And shall continue our graces towards him.
By your leave, hostess.

[Exeunt.]

# دیمەنی حەفتەم

## هەمان شوێن، ژوورێکی ناو قەڵا

دووزەلەژەن و مەشخەڵ هەڵگر دێنە ژوورو بەسەر تەختەی شانۆدا دەڕۆن،
سەرکاری خزمەتکاران و خزمەتکاری هەمە جۆر خۆراک دێنن و بەردەستی دەکەن.
ئینجا ماکبێس دێتە ناوەوە،

**ماکبێس:** (لەلاوە) ئەگەر ئەو کارەی دەکرێت کۆتایی هەموو شتێک بێت، واباشترە
زوو بکرێت: ئەگەر کوشتنەکە
ڕێ لە سەرەنجامەکەی بگرێت و
بە مردنی ئەو بگاتە کۆتایی: بە جۆرێک ئەو لێدانە
نەک لێدان و لێدانی کۆتایی بوایە لێرە،
تەنانەت لێرەش ئەگەر ئەم کارە لەسەر کەنارۆکەیەکی رۆژگار ببوایە،
ئەوا داهاتوومان بۆ دەخستە مەترسییەوە ـ بەڵام لە رەوشێکی وادا،
لێپرسینەوەمان لێرەیە، کاتێک ئێمە خەڵکی فێری
وانەی خوێن دەکەین، بەمە چاڵ بۆ خۆمان لێ دەدەین
ئەمەش ردێنی خۆمان دەگرێتەوە: ئەو دەستە پڕ دادوەرییە
پیاڵەی پڕ ژەهری خۆمان دەخاتەوە
سەر لێوی خۆمان، ئەو پیاوە لێرە دووجار بڕوای پێمە:
یەکەم: بەوەی خزممەو من هاوڵاتی ئەوم
هەردووکیشیان دژی ئەو کارەن من بەتەمام بیکەم. جا وەک خانەخوێ
دەبێ من دەرگا لە رووی بکوژەکەی دابخەم،
نەک بەخۆم کێردی بۆ هەڵگرم: وێڕای ئەوەش ئەو (دەنکەن)ە
تواناکانی خۆی وا بەنەرمی و ناسکی لەو پایە بەرزەدا بەکارهێناوە



# Scene VII

## The same. A Room in the Castle.

*[Hautboys and torches. Enter, and pass over, the stage*
*a Sewer and divers Servants with dishes and service].*
*[Then enter Macbeth.]*

**MACBETH:**
*[Aside]* If it were done when 'tis done, then 'twere well
It were done quickly. If the assassination
Could trammel up the consequence, and catch,
With his surcease, success; that but this blow
Might be the be-all and the end-all--here,
But here, upon this bank and shoal of time,--
We'd jump the life to come.- But in these cases,
We still have judgement here; that we but teach
Bloody instructions, which, being taught, return
To plague the inventor: this even-handed justice
Commends th' ingredients of our poisoned chalice
To our own lips. He's here in double trust:
First, as I am his kinsman and his subject,
Strong both against the deed: then, as his host,
Who should against his murderer shut the door,
Not bear the knife myself. Besides, this Duncan
Hath borne his faculties so meek, hath been
So clear in his great office, that his virtues

Will plead like angels, trumpet-tongued, against
The deep damnation of his taking-off:
And pity, like a naked new-born babe,
Striding the blast, or heaven's cherubin, horsed
Upon the sightless couriers of the air,
Shall blow the horrid deed in every eye,
That tears shall drown the wind.--I have no spur
To prick the sides of my intent, but only
Vaulting ambition, which o'erleaps itself,
And falls on the other.

*[Enter Lady Macbeth.]*

How now! what news?

**LADY MACBETH:**

He has almost supped. Why have you left the chamber?

**MACBETH:**

Hath he asked for me?

**LADY MACBETH:**

Know you not he has?

**MACBETH:**

We will proceed no further in this business:
He hath honoured me of late; and I have bought
Golden opinions from all sorts of people,
Which would be worn now in their newest gloss,
Not cast aside so soon.

**LADY MACBETH:**

Was the hope drunk
Wherein you dressed yourself? hath it slept since,
And wakes it now, to look so green and pale
At what it did so freely? From this time
Such I account thy love. Art thou afeard
To be the same in thine own act and valour



که چاکەکانی ئەو وەک فریشتە بەدەنگێکی بەرز هاوار دەکەن
لە دژی لابردنە نەفرەتییەکەی:
بەزەییش وەک ساوایەکی تازەبووی رووت
سواری پشتی رەشەبا دەبێت و لەگەڵ مندالآنی ئاسمان
بەسەر پشتی ئەسپی نەبینراوی بادا،
ئەو کارە تۆقێنەرە دەخەنە بەر هەموو چاوێک
تا جیهان لە فرمێسک نغرۆ دەکەن. ـ من خۆم هیچ مەبەستم
نییە لاتەنیشتی ئەو کەسەی مەبەستە بئاژنم، بەڵام تەنیا
ئارەزووی بڵندم خۆ هەڵدەداتە سەر پشتی و
دەکەوێتە سەر لایەکەی تری ––

(خاتوو ماکبێس دێتە ژوور)

چییە! چیت پێیە؟

**خاتوو ماکبێس:** خەریکە نانی شێو تەواو دەکات. بۆ ژوورەکەت جێ هێشت؟

**ماکبێس:** ئەرێ لێی پرسیم؟

**خاتوو ماکبێس:** نازانیت پرسیویەتی؟

**ماکبێس:** چی دی لەو کارە ناچینە پێشەوە.
لەم دواییەدا رێزو شکۆی لێنام، منیش
بیری زێڕینم لە هەموو خەڵکی بۆ خۆم کڕیوە،
دەبێ ئێستا لە نوێترین شەوقدا بیکەمە بەر
نەک وا زوو فڕێی بدەم.

**خاتوو ماکبێس:** ئایا ئەو ئاواتە سەرخۆش بوو
کە کاتی خۆی کردبوونەتە بەر خۆت؟ لەوساوە نوستبووی،
ئێستا بە هۆش خۆت دێیتەوە تا وا ترسنۆک و ڕەنگ زەرد
دەربکەوێت، لە کاتێکدا بەڕەزامەندی خۆت بڕیاری کردنت دابوو؟
لێرەوە بەدوا خۆشەویستیشت هەروا تێ دەگەم. ئەرێ تۆ دەترسیت.
لەوەی کردەوە و ئازایەتیت

وەکو ئارەزوو و خواستەکانت بیت؟ تۆ ئەوەت دەوێت
کە بە مایەی جوانی ژیانی دادەنێیت و
بە ترسنۆکیش تەماشای خۆت دەکەیت،
(ناوێرم) بەلا بنێ و چاوەڕێی (وا دەکەم) بکە و
دەق وەک کابرای ماسیگری جل تەڕنەبووی پەندەکەیت؟

**ماکبێس:** تکایە ، بەسە
هەرچی لە پیاو بوەشێتەوە دەوێرم بیکەم،
ئەوەی لەوە پتر بکات پیاو نییە.

**خاتوو ماکبێس:** چ دڕندەیەک ئەوکات
وای لێ کردیت ئەو مەسەلەیە بە من بڵێیت؟
کە دەوێرایت بیکەیت، ئەوسا پیاو بوویت،
بۆ ئەوەی لە خۆت گەورەتر بیت، تۆ پیاوتر دەبیت.
ئەوسا نەکات و ساتی لەبار هەبوو
بەڵام تۆ دەتەویست ڕێکیان بخەیت:
ئێستا وا بە خۆیان ڕێککەوتوون، ئەرێ ڕێکیانە
وات لێ دەکەن پەشیمان ببیتەوە. من خۆم شیرم داوە،
دەشزانم چەند خۆشەویستە ئەو منداڵەی مەمکم دەمژێت.
بهاتبا وەک تۆ سوێندم بخواردایە،
لەو دەمەی کۆرپەکەم پێم دەخەنێتەوە
گۆی مەمکم لە دەمی بێ ددانی دەردێناو
کەللەسەریم ورد و خاش دەکرد.

**ماکبێس:** ئەگەر سەر نەکەوتین –

**خاتوو ماکبێس:** سەرناکەوین!
بەس تۆ ئازایی وەبەرخۆبێنەوە،
تێ ناکەویت، کە (دەنکەن) دەخەوێت –



As thou art in desire? Wouldst thou have that
Which thou esteem'st the ornament of life,
And live a coward in thine own esteem;
Letting "I dare not" wait upon "I would,"
Like the poor cat i' the adage?

**MACBETH:**

Pr'ythee, peace!
I dare do all that may become a man;
Who dares do more is none.

**LADY MACBETH:**

What beast was't, then,
That made you break this enterprise to me?
When you durst do it, then you were a man;
And, to be more than what you were, you would
Be so much more the man. Nor time nor place
Did then adhere, and yet you would make both:
They have made themselves, and that their fitness now
Does unmake you. I have given suck, and know
How tender 'tis to love the babe that milks me:
I would, while it was smiling in my face,
Have plucked my nipple from his boneless gums
And dashed the brains out, had I so sworn as you
Have done to this.

**MACBETH:**

If we should fail,-

**LADY MACBETH:**

We fail!
But screw your courage to the sticking-place,
And we'll not fail. When Duncan is asleep,

(ماندوویی ڕۆژی سەفەر پڕ بەگەروو

بانگی دەکات) هەردوو پاسەوانەکەی

بە مەیی و بەزم وا وڕ دەکەم

کە هۆشیان – پاسەوانی مێشکیان –

دەبێتە دووکەڵ، ئەوسا مێشک قاپێکی

بۆش دەبێت: ئینجا کە هەستی مەستبوویان

دەچێتە ناو خەوێکی بەرازانەوە وەک مردوویان لێ دێت،

من و تۆ چیمان پێ ناکرێت

لەگەڵ (دەنکەن)ی بێ پاسەوان؟ چیمان پێ ناکرێت

بە مل پاسەوانە سەرخۆشەکانی دابێنین و تاوانی

کوشتنەکەمان دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان؟

**ماکبێس:** تەنها با مرۆڤی نێرینەت ببێت!

مەعدەنی پتەوی تۆ دەبێ تەنها مرۆڤی نێری

لێ بکەوێتەوە. ئاخۆ کە ئێمە هەردوو

پاسەوانی نوستووی ژوورەکەی لە خوێن سوور

دەکەین و خەنجەری خۆیان بەکاردێنین،

وا باوەڕ ناکرێت ئەوان کردوویانە؟

**خاتوو ماکبێس:** کێ دەوێرێت بە جۆرێکی دی لێک بداتەوە

کاتێک هاوار و ڕۆڕۆمان لەسەر تەرمی ئەو بەرز دەبێتەوە!

**ماکبێس:** من بڕیارم داوە و

هەر پارچەیەکی لەشم لە خزمەتی ئەو کارە ترسناکە دادەنێم.

بابڕۆین و بە جوانترین ڕوخسار ڕۆژگار تەفرە بدەین

دڵی درۆزن بە ڕوخساری درۆیاوی ڕووپۆش دەکەین.

(دەڕۆن)



(Whereto the rather shall his day's hard journey
Soundly invite him), his two chamberlains
Will I with wine and wassail so convince
That memory, the warder of the brain,
Shall be a fume, and the receipt of reason
A limbec only: when in swinish sleep
Their drenched natures lie as in a death,
What cannot you and I perform upon
Th' unguarded Duncan? What not put upon
His spongy officers; who shall bear the guilt
Of our great quell?

**MACBETH:**

Bring forth men-children only!
For thy undaunted mettle should compose
Nothing but males. Will it not be received,
When we have marked with blood those sleepy two
Of his own chamber, and used their very daggers,
That they have don't?

**LADY MACBETH:**

Who dares receive it other,
As we shall make our griefs and clamor roar
Upon his death?

**MACBETH:**

I am settled, and bend up
Each corporal agent to this terrible feat.
Away, and mock the time with fairest show:
False face must hide what the false heart doth know.

[Exeunt.]

## Scene I

**The Same. A Court within the Castle.**

*[Enter Banquo, preceeded by Fleance with a torch before him.]*

**BANQUO:**

How goes the night, boy?

**FLEANCE:**

The moon is down; I have not heard the clock.

**BANQUO:**

And she goes down at twelve.

**FLEANCE:**

I take't, 'tis later, sir.

**BANQUO:**

Hold, take my sword.--There's husbandry in heaven;
Their candles are all out:- Take thee that too.
A heavy summons lies like lead upon me,
And yet I would not sleep: merciful powers,
Restrain in me the cursed thoughts that nature
Gives way to in repose!--Give me my sword.
*[Enter Macbeth, and a Servant with a torch.]*
*[To Macbeth]* Who's there?

**MACBETH:**

A friend.

**BANQUO:**

What, sir, not yet at rest? The king's a-bed:
He hath been in unusual pleasure and
Sent forth great largess to your offices.
This diamond he greets your wife withal,
By the name of most kind hostess; and shut up



## دیمەنی یەکەم

هەمان شوێن (ئینڤێرنیس). دەربارێک لە ناو کۆشکدا

(بانکۆ) دێتە ژوورو (فلینس) مەشخەڵێکی لە پێش هەڵگرتووە.

**بانکۆ:** کوڕم، چ کاتی شەوە؟

**فلینس:** مانگ ئاوابووە و گوێشم لە زەنگی سەعات نەبووە.

**بانکۆ:** مانگ لە سەعات دوازدەدا ئاوا دەبێت.

**فلینس:** گەورەم، وا بزانم درەنگترە.

**بانکۆ:** بگرە ئەوە شمشێرەکەم – ئەمشەو ئاسمان قرچۆکی دەکات و
هەموو مۆمەکانی کوژاندۆتەوە. – ها ئەمەش بگرە.
خەوێکی قورس وەک مس بەسەرم داباریوە،
کەچی هێشتاش ناخەوم؛ ئەی هێزە پڕ بەزەییەکان!
ئەو بیرە نەفرەتییانەم لە مێشک رابگرن
کە سروشت لە خەوتندا ڕێگایان بۆ بەردەدات! شمشێرەکەم بدەوە.
(ماکبێس دێتە ژوور و نۆکەرێکی مەشخەڵ بە دەستی لەگەڵدایە)
بۆ (ماکبێس) کێیە؟

**ماکبێس:** دۆستە؟

**بانکۆ:** چییە گەورەم هێشتا نەخەوتوویت؟ پاشا لە ناو نوێنە؛
ئەو بێ ئەندازە شاد بوو و
دیاری بە نرخی بۆ بارەگات ناردبوو؛
ئەو مروارییەکی بە خێزانەکەت بەخشیوە
بە ناوی ئەوەی دڵنەرمترین خانەخوێیە و

In measureless content.

**MACBETH:**

Being unprepared,
Our will became the servant to defect;
Which else should free have wrought.

**BANQUO:**

All's well.
I dreamt last night of the three weird sisters:
To you they have showed some truth.

**MACBETH:**

I think not of them:
Yet, when we can entreat an hour to serve,
We would spend it in some words upon that business,
If you would grant the time.

**BANQUO:**

At your kind'st leisure.

**MACBETH:**

If you shall cleave to my consent, when 'tis,
It shall make honour for you.

**BANQUO:**

So I lose none
In seeking to augment it, but still keep
My bosom franchised, and allegiance clear,
I shall be counselled.

**MACBETH:**

Good repose the while!

**BANQUO:**

Thanks, Sir: the like to you!
*[Exeunt Banquo and Fleance.]*



سەرەنجام لە شادییەکی لە ڕادەبەدەردایە.
**ماکبێس:** لەبەرئەوەی خۆمان بۆ ئامادە نەکردبوو،
ویست و ئارەزووومان کەموکوڕی تێ کەوتووە،
دەنا زۆر بەخشندانەتر رەفتارمان دەکرد.
**بانکۆ:** هەموو شتێک تەواوە.
دوێنێ شەو خەوم بەو سێ خوشکەی چارەنووسەوە بینی:
هەندێک ڕاستییان بۆ تۆ دەرخست.
**ماکبێس:** بیریان لێ ناکەمەوە؛
بەهەرحاڵ، ئەگەر کاتمان هەبێت
ئەوا چەند قسەیەک لەو بارەیەوە دەکەین،
بەمەرجێ تۆ ماوەت هەبێت.
**بانکۆ:** هەر کەی حەز بکەیت.
**ماکبێس:** ئەگەر لایەنی من بگری، ئەوکات
سەربەرزی دیکەت پێ دەبەخشم.
**بانکۆ:** هیچم لەدەست ناچێت
ئەگەر هەوڵی پترکردنی بدەم،
بەڵام هەمیشە سینەم بێ گوناه دێڵمەوەو
دەبێت دڵسۆزیم دیار بێت. گوێ لە ئامۆژگاریت دەگرم.
**ماکبێس:** ئێستا شەوباش!
**بانکۆ:** سوپاس گەورەم، باشتر.
(بانکۆ و فلینس دەڕۆن)

**MACBETH:**

*[To the Servant]* Go bid thy mistress, when my drink is ready,
She strike upon the bell. Get thee to bed.
*[Exit Servant.]*
Is this a dagger which I see before me,
The handle toward my hand? *[He speaks to the dagger]* Come,
let me clutch thee:--
I have thee not, and yet I see thee still.
Art thou not, fatal vision, sensible
To feeling as to sight? or art thou but
A dagger of the mind, a false creation,
Proceeding from the heat-oppressed brain?
I see thee yet, in form as palpable
As this which now I draw.
Thou marshall'st me the way that I was going;
And such an instrument I was to use.-
Mine eyes are made the fools o' the other senses,
Or else worth all the rest. I see thee still;
And on thy blade and dudgeon gouts of blood,
Which was not so before.-There's no such thing.
It is the bloody business which informs
Thus to mine eyes.-Now o'er the one half-world
Nature seems dead, and wicked dreams abuse
The curtained sleep; now witchcraft celebrates
Pale Hecate's offerings; and withered Murder,
Alarumed by his sentinel, the wolf,



**ماکبێس:** (بۆخزمەتکارێک) برۆ بە خانم بڵێ هەرکە خواردنەوەکەم ئامادەبێت
با زەنگ لێ بدات. دوایی برۆ بخەوە.
(خزمەتکارەکە دەڕوات).
ئەرێ ئەوەی پێشم خەنجەرە دەیبینم،
دەسکەکەی ڕووی لە دەستمە؟ (لەگەڵ خەنجەرەکە دەدوێت) وەرە،
لێمگەڕێ بابتگرم:-
تۆم بۆ ناگیرێ، کەچی هەر دەتبینم –
ئەی  دیمەنی مەرگین، ئەرێ چۆنە تۆ بۆ دیتن
لەبەرچاوی، بۆ هەستەکانی دی وانیت؟ یان تۆ
تەنیا خەنجەرێکی خەیاڵیت و دروستکراوێکی ساختەیت و
دەسکردی مێشکێکی گەرمی پەنگ پێ خوراویت؟
هێشتاش من شێوەت وا بە بەرجەستەیی دەبینم
وەک بڵێ هەڵیدەکێشم.
لەو ڕێگایەی دەمەوێ بۆی بچم تۆ بە پێشم دەکەویت،
ئامرازێکی واش بۆ ئەو مەبەستە بەکاردێنم –
چاوەکانم بوونەتە گاڵتەجاڕی هەستەکانی ترم،
یان دەبێ لەوانی دی پتر متمانەیان پێ بکەم؛ هێشتاش دەتبینم؛
تیغ و دەسکەکەت بە دڵۆپە خوێنە،
پێشتر وانەبوو– شتی وانییە.
ئەو کارە خوێناوییەیە کەوا خۆ لە بەرچاوم
دەنوێنێت – ئێستا لە نیوەی جیهاندا
وا پێ دەچێت سروشت مردووبێ، خەونی بەد
تایبەتمەندێتی خەوی پەردەدار دەخاپێنێت: جادووگەران ئاهەنگ
بۆ بەخششەکانی (هێکێت)ی ڕەنگزەرد دەگێڕن،
مەرگی ژاکاویش کە گورگ پاسەوانیەتی

Whose howl's his watch, thus with his stealthy pace,
With Tarquin's ravishing strides, towards his design
Moves like a ghost.-Thou sure and firm-set earth,
Hear not my steps, which way they walk, for fear
Thy very stones prate of my whereabout,
And take the present horror from the time,
Which now suits with it. Whiles I threat, he lives;
Words to the heat of deeds too cold breath gives.

*[A bell rings.]*

I go, and it is done; the bell invites me.
Hear it not, Duncan, for it is a knell
That summons thee to heaven or to hell.

*[Exit.]*



که لوورەکەی پاسەوانییەتی خۆی وریا دەکاتەوە و بە هەنگاوە بەدزییەکانی،
بە شاقاوە خێراو بێ دەنگەکانی (تارکوین)[٤]
وەک تارمایی مردوو بەرەو پلانەکەی دەخشێت – ئەی زەمینی ساغ و
چەسپاو هەنگاوەکانم مەبیسەو مەزانە بەرەو کوێ دەچن،
چونکە دەترسم بەردەکانت چەنە لەسەر جێ و ڕێم لێ بدەن،
ئەو ترسە مەزنە لە کات بسەنەوە کە ئێستا لەگەڵیا گونجاوە؛
لەو دەمەی من هەڕەشەی مەرگی لێ دەکەم ئەو دەژیت؛
قسە هەناسەی ساردوسڕ بە گەرمی کردار دەبەخشێت.

(زەنگێک لێ دەدرێت)

دەڕۆم کەواتە رێکخراوە؛ ئەوە زەنگە بانگم دەکات.
(دەنکەن) ئەو زەنگە مەبیسە کە مەرگی تۆ ڕادەگەیەنێت
سەرەنجام تۆ یان بە بەهەشت یاخود بە دۆزەخ دەگەیەنێت.

(٤) تارکوین: زاڵمێکی مێژوویی ڕۆمانییەو لە سەدەی شەشەمی پێش زاین ژیاوە، بەشەو بە دزی چووە ژووری (لۆکریسیا)ی ژنی ئامۆزای و زانی مێردی لەوێ نییەو سواری بوو. ژنە داوای فریاکەوتنی لە باوکی و مێردی کرد و کە هاتن بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە و داوای تۆڵەی لێ کردن و خۆی کوشت. ئەمەش بووە هۆی شەڕی ناوخۆیی لە ڕۆمانیا. جا (مەسەلەی لۆکریسیا) بووە بابەتی زۆربەی هونەرمەندان و نووسەرانی سەردەمی ڕێنیسانس.

# دیمەنی دووەم

## هـەمان شوێن

خاتوو ماکبێس دێتە ژوور.

**خاتوو ماکبێس:** ئەوەی ئەوانی مەست کرد، منی جۆشاند

ئەوەی ئەوانی دامرکاندەوە، گڕی لەمن بەردا، گوێ بگرە!– کڕ بە!

ئەوە کوندەبۆ بوو، زەنگ لێدەری مردووان بوو،

دوا ماڵاواییکەر بوو قڕاندی، ئەو بەکارەکەوە خەریکە،

دەرگاکان واڵان و پاسەوانە مڕەکانیش بە پرخ و هۆڕ

گاڵتە بە لێپرسراوێتی دەکەن، من دەرمانم لەناو شەرابە بەهێزەکانیان کردووە

مەرگ و سروشت بە جۆرێ لە ناخیاندا لە ململانێدان و

کەس نازانێت دەژین یان دەمرن.

**ماکبێس:** (لە ناوەوە) کێیە؟ – چی، هۆ!

**خاتوو ماکبێس:** ئۆف! دەترسم بێدار بووبنەوە و

کارەکەش نەکرابێت: هەوڵدانمان نەک کارەکە

لە ناومان دەبات – گوێ رادێرە! – خەنجەرەکانیانم

ئامادە کردبوو، نابێ نەیانبینێتەوە. ئەگەر بەس لە خەودا بەباوکم

نەچووبا بە خۆم دەمکوشت. ئەی پیاوەکەم!

(ماکبێس دێتە ژوور)

**ماکبێس:** کارەکەم کرد – گوێت لە هیچ نەبوو؟

**خاتوو ماکبێس:** گوێم لە قڕەی کوندەبۆ بوو، جرجرەش دەیچریکاند

تۆ نەبوویت قسەت کرد؟

**ماکبێس:** کەی؟



# Scene II

## The Same

*[Enter Lady Macbeth.]*

**LADY MACBETH:**

That which hath made them drunk hath made me bold:
What hath quench'd them hath given me fire.--Hark!--Peace!
It was the owl that shriek'd, the fatal bellman,
Which gives the stern'st good night. He is about it:
The doors are open; and the surfeited grooms
Do mock their charge with snores. I have drugged their possets
That death and nature do contend about them,
Whether they live or die.

**MACBETH:**

[Within.] Who's there?--what, ho!

**LADY MACBETH:**

Alack! I am afraid they have awaked,
And 'tis not done:- the attempt, and not the deed,
Confounds us.--Hark!--I laid their daggers ready;
He could not miss 'em.--Had he not resembled
My father as he slept, I had done't.--My husband!
*[Re-enter Macbeth.]*

**MACBETH:**

I have done the deed.--Didst thou not hear a noise?

**LADY MACBETH:**

I heard the owl scream, and the crickets cry.
Did not you speak?

**MACBETH:**

When?

**LADY MACBETH:**

Now.

**MACBETH:**

As I descended?

**LADY MACBETH:**

Ay.

**MACBETH:**

Hark!--

Who lies i' the second chamber?

**LADY MACBETH:**

Donalbain.

**MACBETH:**

*[Looking on his hands.]* This is a sorry sight.

**LADY MACBETH:**

A foolish thought, to say a sorry sight.

**MACBETH:**

There's one did laugh in's sleep, and one cried, "Murder!"
That they did wake each other: I stood and heard them:
But they did say their prayers, and addressed them
Again to sleep.

**LADY MACBETH:**

There are two lodged together.

**MACBETH:**

One cried, "God bless us!" and, "Amen," the other;
As they had seen me with these hangman's hands.
Listening their fear, I could not say "Amen,"
When they did say, "God bless us."

**LADY MACBETH:**

Consider it not so deeply.

**MACBETH:**

But wherefore could not I pronounce "Amen"?



**خاتوو ماکبێس:** ئێستا.

**ماکبێس:** کە هاتمە خوار؟

**خاتوو ماکبێس:** بەڵێ.

**ماکبێس:** گوێ بگرە!

کێ لە ژوورەکەی ترە؟

**خاتوو ماکبێس:** دۆناڵبێن.

**ماکبێس:** (تەماشای دەستەکانی دەکات) چ دیمەنێکی خەفەتهێنە.

**خاتوو ماکبێس:** گەوجێتییە وا بڵێیت.

**ماکبێس:** یەکێکیان لەخەو پێکەنی، ئەوی تر هاواری کرد (کوشتن!)
یەکتریان هۆشیار کردەوە: من وەستام و گوێم لێیان بوو،
بەڵام نوێژی خۆیان کرد و دیسان
خۆیان ئامادە کردەوە بۆ خەوتنەوە.

**خاتوو ماکبێس:** هەردووکیان لە ژوورێدا پێکەوە خەوتوون.

**ماکبێس:** کاتێک منیان بەو دوو دەستە پیاوکوژانە دی
یەکێکیان قیژاندی (خوا پیرۆزمان بکات!) ئەوی تریان(ئامین).
گەرچی گوێشم لە قسەی بە ترسیان بوو، نەمتوانی بڵێم (ئامین)
هەرکە ئەوان گوتیان (خوا پیرۆزمان بکات!)

**خاتوو ماکبێس:** ئەوەندە قووڵ بیری لێ مەکەوە.

**ماکبێس:** بەڵام بۆچ نەمتوانی بڵێم (ئامین)؟

I had most need of blessing, and "Amen"
Stuck in my throat.

**LADY MACBETH:**

These deeds must not be thought
After these ways; so, it will make us mad.

**MACBETH:**

Methought I heard a voice cry, "Sleep no more!
Macbeth does murder sleep,"--the innocent sleep;
Sleep, that knits up the ravelled sleave of care,
The death of each day's life, sore labour's bath,
Balm of hurt minds, great nature's second course,
Chief nourisher in life's feast.

**LADY MACBETH:**

What do you mean?

**MACBETH:**

Still it cried, "Sleep no more!" to all the house:
"Glamis hath murdered sleep, and therefore Cawdor
Shall sleep no more, Macbeth shall sleep no more!"

**LADY MACBETH:**

Who was it that thus cried? Why, worthy thane,
You do unbend your noble strength, to think
So brainsickly of things.--Go get some water,
And wash this filthy witness from your hand.--
Why did you bring these daggers from the place?
They must lie there: go carry them; and smear
The sleepy grooms with blood.

**MACBETH:**

I'll go no more:
I am afraid to think what I have done;



من یەگجار پێویستم بە پیرۆزی هەبوو و
(ئامین) لە گەرووم چەقی.

**خاتوو ماکبێس:** نابێ وابیر لەو کارانە بکەینەوە
دەنا شێتمان دەکەن.

**ماکبێس:** دەنگێکی وا هاتە بەرگوێم کە دەیگوت «چی دی مەخەوە!
ماکبێس خەوی کوشتووە» خەوی بەستەزمان،
ئەو خەوەی کە گلۆڵەی تێکئالاوی خەفەت
ڕێک دەخاتەوەو مەرگی ژیانی ڕۆژانەو
شوشتنگای کاری قورسی ڕۆژانەیە و
دەرمانی مێشکی بریندارمانە؛ دووەم ژەمی مەزنی سروشتە،
شاخۆراکدەرە لە شایلۆغانی ژیاندا:–

**خاتوو ماکبێس:** مەبەستت چییە؟

**ماکبێس:** هەر هاواری دەکرد (خەڵکی ئەو ماڵە، چی دی مەخەون!)
(گلێمس خەوی کوشت، بۆیە کۆدۆ چیدی ناخەوێت،
نابێ ماکبێس چیدی بخەوێت!)

**خاتوو ماکبێس:** کێ بوو هاواری دەکرد؟ ئەی سەرداری هێژا
بۆچ وا ورەی جوانمەردانەت لە دەست دەدەیت،
کەوا بە مێشک نەساغییەوە بیر لەو شتانە بکەیتەوە.
بڕۆ هەندێک ئاو بەو بەڵگە پیسەی سەر دەستت دابکەو بیشۆ. –
بۆچ ئەو خەنجەرانەت لەگەڵ خۆت هێناوە؟
دەبوایە ئەوانە لەوێ بووان، بڕۆ، بیان بەرەوە ئەوێ و
خوێنەکەی لە پاسەوانە خەوتووەکان هەڵسوو.

**ماکبێس:** ناچمەوە ئەوێ،
کە بیر لەو کارەم دەکەمەوە دەترسم،

ناوێرم تەماشای بکەم.

**خاتوو ماکبێس:** هەی بڕوا لەقاو!

خەنجەرەکانم بدەرێ، خەوتوو و مردوو

جگە لە وێنە چیتر نین، چاوی منداڵ

لە شەیتانی نیگارکراو دەترسێن، ئەگەر هێشتا خوێنی لەبەر بڕوات

دەموچاوی پاسەوانەکانی پێ خوێناوی دەکەم

دەبێ وا دەربکەوێت کەتنەکە هی ئەوانە.

(دەڕۆن، لە ناوەوەڕا لە دەرگا دەدرێ)

**ماکبێس:** ئەوە لە کوێ لە دەرگا دەدرێ؟ –

چیم لێ هاتووە، هەموو دەنگێک دەمترسێنێت؟

ئەو دەستانەی ئەوێ چین؟ ها! چاوم دەردێنن.

ئاخۆ هەموو ئاوی شادەریاکان ئەو خوێنەی

دەستم دەشۆن؟ نەخێر ، ئەو دەستانەم

تەنانەت هەموو ئاوی دەریاکان

لە سەوزییەوە سوور هەڵدەگەڕێین.

(خاتوو ماکبێس دێتە ژوور)

**خاتوو ماکبێس:** دەستەکانی منیش بە ڕەنگی هی تۆن؛ بەڵام شەرم دەکەم

دڵێکی وا سپیم(٥) هەبێت. (لە دەرگادان) گوێم لە لێدانی دەرگای

لای خوارەوەیە: با بچینەوە ژووری خۆمان

بە نەختێ ئاو لەو کارە خاوێن دەبینەوە:

دە بزانە چەند ئاسانە! ورەت

نەماوە.(لە دەرگادان) گوێ بگرە! هێشتا لێ دەدرێت

جلی خەوتن لەبەر بکە نەوەک وا بخوازێت ئامادە بین و

ببینە بینەری ئەو کارە.– ئەوەندە

(٥) واتە ترسنۆک.



Look on't again I dare not.

**LADY MACBETH:**

Infirm of purpose!
Give me the daggers: the sleeping and the dead
Are but as pictures: 'tis the eye of childhood
That fears a painted devil. If he do bleed,
I'll gild the faces of the grooms withal,
For it must seem their guilt.

*[Exit. Knocking within.]*

**MACBETH:**

Whence is that knocking? -
How is't with me, when every noise appals me?
What hands are here? Ha, they pluck out mine eyes.
Will all great Neptune's ocean wash this blood
Clean from my hand? No; this my hand will rather
The multitudinous seas incarnadine,
Making the green one red.

*[Re-enter Lady Macbeth.]*

**LADY MACBETH:**

My hands are of your color, but I shame
To wear a heart so white. *[Knock.]* I hear knocking
At the south entry: retire we to our chamber.
A little water clears us of this deed:
How easy is it then! Your constancy
Hath left you unattended.--*[Knock.]* Hark, more knocking:
Get on your nightgown, lest occasion call us
And show us to be watchers:- Be not lost

نقوومی ناو بیرکردنەوە مەبە.

**ماکبێس:** ئەگەر بمەوێ بزانم چیم کردووە، باشترە خۆم نەناسم.

(لە دەرگادان)

دەنکەن لەگەڵ ئەو لێدانە واگا وەرەوە : خۆزیا واگابێتەوە.

(دەڕۆن)



So poorly in your thoughts.

**MACBETH:**

To know my deed, 'twere best not know myself.

*[Knock.]*

Wake Duncan with thy knocking! I would thou couldst!

*[Exeunt.]*

# دیمەنی سێیەم

## هەمان شوێن

دەرگاوانێک دێتە ناوەوە (لە ناوەوە لە دەرگا دەدرێت).

**دەرگاوان:** خۆ بەڕاستی لە دەرگا دەدرێت! ئەگەر مرۆڤ دەرگاوانی دۆزەخ بێت دەبێ زۆر کلیل با بدات. (لە دەرگا دەدرێت) لێدە، لێدە، لێدە. کێیە، بۆ خاتری بێلزە باب(٦)؟ جووتیارێک هەبوو خۆی هەڵواسی چونکە چاوەڕێی یەکەم بەروبووم و هات بوو: لە وەختێکی باش هاتیت، با زۆر دەستەسڕتان پێ بێت؛ چونکە لەوێ زۆر ئارەقە دەکەن.(لە دەرگادان) لێدە، لێدە. ئەوە کێیە بۆ خاتری ناوەکەی دی شەیتان؟ بەخوا، لێرە قسەگۆڕێک هەیە کە لە هەردوولادا دژ بەیەک قسەی دەکرد و لە پێناو خوادا زۆر خیانەتی کرد(*)، بەڵام نەیتوانی لەگەڵ ئاسمان وا قسە بکات، ئۆ! وەرە ناوەوە، هەی قسەگۆڕ. (لە دەرگادان) لێدە، لێدە، کێیە؟ بەخوا بەرگدرووێک هەبوو و هاتبووە ئێرە چونکە پانتۆڵێکی فەرەنسی دزی بوو. وەرە ژوور، بەرگدروو، ڕەنگە ئوتووە مل قازینەکەت(٧) لێرە سوور بکەیتەوە. (لە دەرگادان) لێدە، لێدە، هیچ مەوەستە! تۆ کێیت؟ – بەڵام ئەو شوێنە زۆر لەوە ساردترە ببێتە دۆزەخ. چیدی نابمە دەرگاوانی دۆزەخ: بیرم لەوە کردۆتەوە لە هەر پیشەیەکدا هەندێک لەوانەی بەسەر ڕێچکەی گوڵیندا دەچن ببەمە ناو ئاگرە سوورەی سەرمەدییەوە (لە دەرگادان) واهاتم و واهاتم: تکام وایە چاوێکتان لە دەرگاوان بێت.

(دەرگا دەکاتەوە)

---

(٦) بلێزە باب: یەکێک لە ناوەکانی شەیتانە.

(*) لە سەردەمی شێکسپیردا زۆربەی خەڵکی ئینگلیز لەوە دەترسان کلێسای کاسۆلیکی ڕۆمانی دەسەڵاتی شا (جێمس یەکەم)ی پرۆنستانی بۆوخێنێت. دەرگاوان مەبەستی لەو قسەیە ئەوەیە یەکێک بۆ خاتری کلێساکەی خیانەت لە وڵاتەکەی بکات.

(٧) واتە ئوتووەکەت؛ چونکە دەسکی ئوتوو وەک ملی قازە.



## Scene III

### The same

*[Enter a Porter.]*

*[Knocking within.]*

**PORTER:**

Here's a knocking indeed! If a man were porter of hell-gate, he should have old turning the key. *[Knocking.]* Knock, knock, knock. Who's there, i' the name of Belzebub?- Here's a farmer that hanged himself on the expectation of plenty: come in time; have napkins enough about you; here you'll sweat for't.--*[Knocking.]* Knock, knock! Who's there, i' the other devil's name?- Faith, here's anequivocator, that could swear in both the scales against either scale, who committed treason enough for God's sake, yet could not knock, equivocate to heaven: O, come in, equivocator. *[Knocking.]* Knock, knock! Who's there?- Faith, here's an English tailor come hither, for stealing out of a French hose: come in, tailor; here you may roast your goose.-- *[Knocking.]* Knock, knock: never at quiet! What are you?--But this place is too cold for hell. I'll devil-porter it no further: I had thought to have let in some of all professions, that go the primrose way to the ever-lasting bonfire. *[Knocking.]* Anon, anon! I pray you, remember the porter.

*[Opens the gate.]*

*[Enter Macduff and Lennox.]*

**MACDUFF:**

Was it so late, friend, ere you went to bed,
That you do lie so late?

**PORTER:**

'Faith, sir, we were carousing till the second cock:
And drink, sir, is a great provoker of three things.

**MACDUFF:**

What three things does drink especially provoke?

**PORTER:**

Marry, Sir, nose-painting, sleep, and urine. Lechery, sir, it provokes and unprovokes; it provokes the desire, but it takes away the performance. Therefore, much drink may be said to be an equivocator with lechery: it makes him, and it mars him; it sets him on, and it takes him off; it persuades him, and disheartens him; makes him stand to, and not stand to: in conclusion, equivocates him in a sleep, and giving him the lie, leaves him.

**MACDUFF:**

I believe drink gave thee the lie last night.

**PORTER:**

That it did, Sir, i' the very throat o' me; but I requited him for his lie; and, I think, being too strong for him, though he took up my legs sometime, yet I made a shift to cast him.

**MACDUFF:**

Is thy master stirring?--

*[Enter Macbeth.]*

Our knocking has awak'd him; here he comes.

**LENNOX:**

*[To Macbeth]* Good morrow, noble Sir!



(ماکدەف و لینۆکس دێنە ناوەوە)

**مالکۆڵم:** هاورێ، دەڵێی درەنگ چوویتە ناو نوێن
تا وا درەنگ خەبەرت بێتەوە؟

**دەرگاوان:** بەخوا گەورەم ئێمە تا دوای دووەم قووقە بەدمەستیمان
دەکرد، خواردنەوەش، گەورەم  وروژێنەری سێ شتە.

**ماکدەف:** ئەو سێ شتانە چین کە بە تایبەتی خواردنەوە دەیانوروژێنێت.

**دەرگاوان:** بە مەریەم، گەورەم، لووت سووربوونەوە، خەوهاتن و میزکردن. گەورەم، خواردنەوە هەوەس هەڵدەسێنێت و هەڵیشی ناسێنێت: ئارەزوو دەوروژێنێت بەڵام کردنەکە ناهێڵێت. بۆیە لەوانەیە بگوترێ زۆر خواردنەوە پاک لەپاککەرەوەی هەوەسە، هەرامەکە والێ دەکات و تێکیشی دەدات: رەپی دەکات و تەپی دەکات، ورەی بەرز دەکاتەوە و ورەشی پێ بەردەدات. وای لێ دەکات بۆی راوەستێ و بۆشی رانەوەستێت: لە کۆتاییدا، لە خەوتن بۆی تێ دێنێتەوە بەوەی پاڵی دەخات و بەجێی دێڵێت.

**ماکدەف:** وا بزانم دوێنێ شەو خواردنەوە پاڵی خستیت.

**دەرگاوان:** گەورەم وای کرد، لە ناو ئەو گەرووەی مندا؛ بەڵام بزانە چۆن چاکەی کەتنی پاڵخستنەکەم دایەوە، چونکە لەو زۆر بە هێزتر بووم، هەرچەندە چەند جار لاقەکانی بردم، بەڵام جوولەیەکم کردو تێم هەڵدا.

**ماکدەف:** ئەرێ گەورەت هۆشیارە؟

(ماکبێس دێتە ژوور)

لە دەرگادانمان خەبەری کردۆتەوە، ئاو ئەوەیە دێت؟

**لینۆکس:** (ماکبێس) بەیانیت باش، گەورەی مەزن!

**MACBETH:**

Good morrow, both!

**MACDUFF:**

Is the king stirring, worthy thane?

**MACBETH:**

Not yet.

**MACDUFF:**

He did command me to call timely on him:

I have almost slipped the hour.

**MACBETH:**

I'll bring you to him.

**MACDUFF:**

I know this is a joyful trouble to you;

But yet 'tis one.

**MACBETH:**

The labour we delight in physics pain.

This is the door.

**MACDUFF:**

I'll make so bold to call.

For 'tis my limited service.

*[Exit.]*

**LENNOX:**

Goes the king hence to-day?

**MACBETH:**

He does:- he did appoint so.

**LENNOX:**

The night has been unruly: where we lay,

Our chimneys were blown down: and, as they say,

Lamentings heard i' the air, strange screams of death;

And prophesying, with accents terrible,



**ماكبێس:** بەیانی باش لە هەردووكتان.

**ماكدەف:** ئەی سەرداری هێژا، شا بەخەبەرە؟

**ماكبێس:** هێشتا.

**ماكدەف:** ئەو فەرمانی پێدابووم زوو بانگی بكەم:

نزیكەی سەعاتێكم بەسەر بردووە.

**ماكبێس:** دەتبەمە لای.

**ماكدەف:** دەزانم ئەو زەحمەتەت پێ خۆشە.

هەرچەندە ناخۆشیشە.

**ماكبێس:** ئەوەی پێمان خۆشە، دەرمانی لەشە.

ئەوە دەرگاكەیەتی.

**ماكدەف:** زۆر لە خۆ دەكەم و بانگی دەكەم

چونكە ئەوە ئەركی دیاریكراومە.

(دەڕوات)

**لینۆكس:** شا ئەمڕۆ دەڕوات؟

**ماكبێس:** دەڕوات: – وای دانابوو.

**لینۆكس:** شەوێكی تووش و ناخۆش بوو؛ لەو شوێنەی خەوتبووین

ڕەشەبا سەركلاوەی باكێشەكانمانی فڕاندبوو و خەڵك دەڵێن

دەنگی شیوەن لەناو بادا دەهات؛ هاواری سەیری مەرگ

بە دەنگی تۆقێنەر پێشبینی لە پشێوییەكی سامناك و

ڕووداوی بێ سەروبەر کە هەر تازە لەو دەمە خەفەتناکەدا
بۆ دونیاترووکابوو دەکرد
باڵندە سەیرەکەی تاریکیش(*) بە درێژایی شەو دەیقڕاند
هەندێکیش دەڵێن زەوی لەرزو تای لێ هاتبوو.

**ماکبێس:** ئای کە شەوێکی ناخۆش بوو.

**لینۆکس:** بەدرێژایی تەمەنی گەنجانەم ناتوانم
شەوێکی دی وا ناخۆش و نالەبارم لە بیر بێت.

(ماکدەف دەگەڕێتەوە)

**ماکدەف:** وای لەو ترسناکییە! ترسناکی! ترسناکی! نە دڵ دەتوانێت
بەر ئەندێشەت بخات و نە زمان دەتوانێ باست لێوە بکات!

**ماکبێس:** / **لینۆکس:** چییە؟

**ماکدەف:** تێکدان شاکەتنی خۆی کردووە!
کوشتنی هەرە گاورانە
پەرستگای پیرۆزکراوی خودای کردۆتەوە و
ژیانی ئەو خانەیەی ئەوێی دزیوە!

**ماکبێس:** ئەوە چی دەڵێیت؟ ژیانی چی؟

**لینۆکس:** مەبەستت لە خاوەن شکۆیە؟

**ماکدەف:** بچۆ ژوورێ و دیدەت بە ڕوخساری
درنجێکی نوێ کوێر بکە - پێم مەڵێن قسە بکە:
بدینن و پاشان خۆتان بدوێن.

(ماکبێس و لینۆکس دەڕۆن)

هەڵسن ! هەڵسن!-

(*) مەبەست لە باڵندەی تاریکی (کوندە بەبۆ)یە.



Of dire combustion, and confused events,
New hatched to the woeful time.
The obscure bird clamoured the live-long night;
Some say the earth was feverous, and did shake.

**MACBETH:**
'Twas a rough night.

**LENNOX:**
My young remembrance cannot parallel
A fellow to it.

*[Re-enter Macduff.]*

**MACDUFF:**
O horror, horror, horror! Tongue nor heart
Cannot conceive, nor name thee!

**MACBETH and LENNOX:**
What's the matter?

**MACDUFF:**
Confusion now hath made his masterpiece!
Most sacrilegious murder hath broke ope
The Lord's anointed temple, and stole thence
The life o' the building.

**MACBETH:**
What is't you say? the life?

**LENNOX:**
Mean you his majesty?

**MACDUFF:**
Approach the chamber, and destroy your sight
With a new Gorgon:--Do not bid me speak;
See, and then speak yourselves.

*[Exeunt Macbeth and Lennox.]*

Awake, awake!--

زەنگی مەترسی لێدەن – کوشتن و خیانەت!
بانکۆ و دۆناڵبێن! مالکۆڵم! هەڵسن!
ئەو خەوە نەرمە راوەشێنن کە هاووێنەی مەرگە،
وەرن سەیری مەرگ بە خۆی بکەن!– هەڵسن، هەڵسن،
دیمەنی رۆژی قیامەت ببینن!– مالکۆڵم ! بانکۆ !
لە گۆڕەکانتان هەڵسنەوە و وەک تارمایی
بۆ تەماشای ئەو ترسناکییە بڕۆن! زەنگ لێ دەن!

(زەنگ لێ دەدرێت)

(خاتوو ماکبێس دێتە ناوەوە)

**خاتوو ماکبێس:** چی قەوماوە
وا ئەو شەیپوورە ترسناکە داوای کۆبوونەوە
لە خەوتووانی ئەو ماڵە دەکات؟ بدوێ، بدوێ!

**ماکدەف:** ئەی خانمی ناسک
بۆ تۆ نەهاتووە ئەوەی دەیڵێم بیبیسی؛
دووبارەکردنەوەی ئەوە لە گوێی ئافرەتدا
لە خۆیدا کوشتنێکە بۆ خۆی.

(بانکۆ دێتە ژوور)

بانکۆ ! بانکۆ !
شای سەروەرمان کوژراوە!

**خاتوو ماکبێس:** ئاخ، مخابن!
چی! لە ماڵی ئێمەدا؟

**بانکۆ:** لە هەرکوێ بوا، کارێکی یەگجار بێ بەزەییانە بوو،
(دەف)ی خۆشەویست، تکایە، دژی قسەکانی خۆت بەو
بڵێ وانییە.

(ماکبێس و لینۆکس دەگەڕێنەوە ناوەوە)



Ring the alarum bell:--Murder and treason!
Banquo and Donalbain! Malcolm! awake!
Shake off this downy sleep, death's counterfeit,
And look on death itself! up, up, and see
The great doom's image!- Malcolm! Banquo!
As from your graves rise up, and walk like sprites
To countenance this horror!

*[Bell rings.]*

*[Enter Lady Macbeth.]*

**LADY MACBETH:**
What's the business,
That such a hideous trumpet calls to parley
The sleepers of the house? speak, speak!

**MACDUFF:**
O gentle lady,
'Tis not for you to hear what I can speak:
The repetition, in a woman's ear,
Would murder as it fell.

*[Enter Banquo.]*

O Banquo, Banquo!
Our royal master's murdered!

**LADY MACBETH:**
Woe, alas!
What, in our house?

**BANQUO:**
Too cruel anywhere.--
Dear Duff, I pr'ythee, contradict thyself,
And say it is not so.

*[Re-enter Macbeth and Lennox.]*

**ماکبێس:** بهاتبا سەعاتێک پێش ئەو رووداوە بمردبام،

ژیانێکی پیرۆزم بەسەربردبوو. چونکە لێرە بەدواوە،

هیچ شتێک لە ژیانی مرۆڤدا گرنگ نییە،

هەمووی گەمەو گاڵتەیە: ناوبانگ و چاکە مردوون،

مەی ژیان رژاوە و تەنیا خڵتە

لە ناو ئەو دەفرە خڕە(٨) ماوە لافی پێوە لێ بدات.

(ماڵکۆڵم و دۆناڵبێن دێن)

**دۆناڵبێن:** چی بزرە؟

**ماکبێس:** ئێوە، بەخۆشتان نازانن.

کانی، سەرچاوە و قەڵبەزەی خوێنتان

چک بووە و سەرچاوەکەی وشک بووە.

**ماکدەف:** شای باوکت کوژراوە.

**مالکۆڵم:** ئاهـ! کێ کوشتوویەتی؟

**لینۆکس:** پێ دەچێت ئەوانی ژوورەکەی ئەو کەتنەیان کردبێت:

دەست و دەموچاویان لە خوێندا سوورە و

خەنجەرەکانیشیانمان بە نەسڕاوەیی

لەسەر سەرینەکانیان دۆزییەوە

وا چاوزەق و خەیاڵ بردوو دیار بوون:

نەدەبوا ژیانی هیچ کەسێکیان پێ بسپێرابوایە.

**ماکبێس:** ئای؟ چەند لەوە پەشیمانم

کە لە تووڕەییان هەردووکم کوشتن.

**ماکدەف:** بۆ وات کرد؟

---

(٨) واتە گۆی زەوی.



**MACBETH:**

Had I but died an hour before this chance,

I had lived a blessed time; for, from this instant

There's nothing serious in mortality:

All is but toys: renown and grace is dead;

The wine of life is drawn, and the mere lees

Is left this vault to brag of.

*[Enter Malcolm and Donalbain.]*

**DONALBAIN:**

What is amiss?

**MACBETH:**

You are, and do not know't:

The spring, the head, the fountain of your blood

Is stopped; the very source of it is stopped.

**MACDUFF:**

Your royal father's murdered.

**MALCOLM:**

O, by whom?

**LENNOX:**

Those of his chamber, as it seemed, had done't:

Their hands and faces were all badged with blood;

So were their daggers, which, unwiped, we found

Upon their pillows:

They stared, and were distracted; no man's life

Was to be trusted with them.

**MACBETH:**

O, yet I do repent me of my fury,

That I did kill them.

**MACDUFF:**

Wherefore did you so?

**ماکبێس:** کێ دەتوانێت ژیر و سەر لێ شێواو، هێمن و تووڕە،

دڵسۆز و بێ هەست بێت لە یەک کاتدا؟ هیچ کەس:

هورووژمی خۆشەویستی توند و تیژم

بەسەر عەقڵی جڵەوگیرمدا ڕەت بوو– (دەنکەن) لەوێ ڕاکشابوو،

پێستی زیوینی بە خوێنی زێڕینی قەیتانی ببوو؛

دەمی برینە کراوەکان دەتگۆت کەلێنی سروشتن

بۆ دەروازەی وێرانکاری: لەوێ بکوژەکان

لە ناو ڕەنگی کارەکانیان نقووم ببوون و خەنجەرەکانیان

بێ تام خوێناوی بوون. کێ دەتوانێت

ئەگەر دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی هەبێ و لەو دڵەشدا ئازایی

هەبێت ڕێ لە دەرخستنی ئەو خۆشەویستییەی بگرێت؟

**خاتوو ماکبێس** (دەبووریتەوە): زوو فریام کەون، هۆ!

**ماکدەف:** ئاگاتان لەو خانمە بێت.

**مالکۆڵم** (لە لاوە بۆ دۆناڵبێن): بۆ زمانی خۆمان گرتووە،

لە کاتێکدا دەبێ بەشی زۆری ئەو گفتوگۆیە ئێمە بیکەین؟

**دۆناڵبێن** (لەلاوە بۆ ماڵکۆڵم): لێرە چی بڵێین

کە چارەنووسمان لە کونۆکەیەکی بچووک خۆی مەڵاس داوە،

ڕەنگە هەڵکوتێتە سەرمان و بمانگرێ؟ با لێرە دووربکەوینەوە:

هێشتا فرمێسکەکانمان نەگەییون!

**مالکۆڵم** (لەلاوە بۆ دۆناڵبێن): هێشتا خەمە ئەستوورەکانیشمان

نەکەوتوونەتە سەر پێ و جووڵە.

**بانکۆ:** چاوتان لەو خانمە بێت:

(خاتوو ماکبێس دەبردرێتە دەرەوە)



**MACBETH:**

Who can be wise, amazed, temperate, and furious,
Loyal and neutral, in a moment? No man:
The expedition of my violent love
Outrun the pauser reason.- Here lay Duncan,
His silver skin laced with his golden blood;
And his gashed stabs looked like a breach in nature
For ruin's wasteful entrance: there, the murderers,
Steeped in the colours of their trade, their daggers
Unmannerly breeched with gore: who could refrain,
That had a heart to love, and in that heart
Courage to make's love known?

**LADY MACBETH:**

*[Fainting]* Help me hence, ho!

**MACDUFF:**

Look to the lady.

**MALCOLM:**

*[Aside to Donalbain]* Why do we hold our tongues,
That most may claim this argument for ours?

**DONALBAIN:**

*[Aside to Malcolm]* What should be spoken
Here, where our fate, hid in an auger hole,
may rush, and seize us? Let's away; our tears
are not yet brew'd.

**MALCOLM:**

*[Aside to Donalbain]* Nor our strong sorrow
Upon the foot of motion.

**BANQUO:**

Look to the lady:--

*[Lady Macbeth is carried out.]*

هەرکە لاشەی ڕووت و قووتمان کە ئێستا
ئازاری بێ پۆشاکی دەچێژێت شاردەوە، ئەوسا با کۆببینەوە و
پرسیار لەو کارە هەرە خوێناوییە بکەین
تا پتری لێ بزانین. ترس و دوودڵی ڕاماندەژەنێت:
پشت و پەنا بە خودای مەزن دەبەستم و
لەمەودوا دژی پیلانی شاردراوە و
خیانەتی بەدکارانە دەجەنگم .

**ماکدەف:** منیش هەروا .

**هەموویان:** هەر هەمووومان .

**خاتوو ماکبێس:** با خێرا جلی پیاوانە لەبەربکەین و
لەناو هۆڵەکە هەموو پێکەوە کۆببینەوە.

**هەموویان:** هەمووومان رازین.

(هەموو دەڕۆن تەنها مالکۆڵم و دۆناڵبێن دەمێننەوە)

**مالکۆڵم:** چی دەکەیت؟ با لەگەڵیان نەڕۆین:
دەرخستنی خەمی هەست پێ نەکراو کارێکە
مرۆڤی درۆزن بە ئاسانی دەیکات. من دەچمە ئینگلتەرا .

**دۆناڵبێن:** منیش دەچمە ئێرلەندا : هەلی بەتەنیابوونمان
بۆ هەردووکمان سەلامەتترە، لێرەدا
خەنجەر لە خەندەی مرۆڤ دەبارێت: خزمی خوێنمان
لە خەڵکی دی خوێناویترە.

**مالکۆڵم:** ئەو تیرە مەرگینەی هاوێژراوە
تا ئێستا نەکەوتۆتەوە و سەلامەتترین ڕێ ئەوەیە
لە بەردەمی دوور کەوینەوە: کەواتە، بۆ سەر ئەسپان!



And when we have our naked frailties hid,
That suffer in exposure, let us meet,
And question this most bloody piece of work
To know it further. Fears and scruples shake us:
In the great hand of God I stand; and thence,
Against the undivulged pretense I fight
Of treasonous malice.

**MACDUFF:**
And so do I.

**ALL:**
So all.

**MACBETH:**
Let's briefly put on manly readiness,
And meet i' the hall together.

**ALL:**
Well contented.

*[Exeunt all but Malcolm and Donalbain.]*

**MALCOLM:**
What will you do? Let's not consort with them:
To show an unfelt sorrow is an office
Which the false man does easy. I'll to England.

**DONALBAIN:**
To Ireland, I; our separated fortune
Shall keep us both the safer: where we are,
There's daggers in men's smiles: the near in blood,
The nearer bloody.

**MALCOLM:**
This murderous shaft that's shot
Hath not yet lighted; and our safest way
Is to avoid the aim: therefore to horse,

And let us not be dainty of leave-taking,
But shift away: there's warrant in that theft
Which steals itself, when there's no mercy left.
[Exeunt.]



با گوێ نەدەینەماڵئاوایی کردن و
زوو بۆی دەرچین. لەو کاتەی کە هیچ بەزەیی نەماوە،
ئەو دزییەی بە نهێنی دەکرێت ڕێی پێ دراوە.
(دەڕۆن)

## Scene IV

**Outside the Castle.**

*[Enter Rosse and an Old Man.]*

**OLD MAN:**

Threescore and ten I can remember well:
Within the volume of which time I have seen
Hours dreadful and things strange; but this sore night
Hath trifled former knowings.

**ROSSE:**

Ha, good father,
Thou seest, the heavens, as troubled with man's act,
Threaten his bloody stage: by the clock 'tis day,
And yet dark night strangles the travelling lamp;
Is't night's predominance, or the day's shame,
That darkness does the face of earth entomb,
When living light should kiss it?

**OLD MAN:**

'Tis unnatural,
Even like the deed that's done. On Tuesday last,
A falcon, towering in her pride of place,
Was by a mousing owl hawked at, and killed.

**ROSSE:**

And Duncan's horses, (a thing most strange and certain)
Beauteous and swift, the minions of their race,
Turned wild in nature, broke their stalls, flung out,
Contending 'gainst obedience, as they would make



## دیمەنی چوارەم

له دەرەوەی قەڵا

رۆز  و پیرەمێردێک دێنە ناوەوە.

**پیرەمێرد:** سێ بیست و دە ساڵم(*) لە بیرە،
لەو ماوەیەدا رۆژانی ترسناک و شتی سەیر و سەمەرەم دیوە
بەڵام ئەو شەوە ناخۆشە
شتە زانراوەکانی پێشتری بێ بایەخ کردووە.

**رۆز:** ئەی باوکی چاک
وەک بینیت دەڵێی ئاسمان لە کاری مرۆڤ پەرێشانە و
هەڕەشە لەو شانۆیە خوێناوییە دەکات: بەهەقی خۆی بێ
دەبێ رۆژ بێت، بەڵام شەوی تاریک چرای گەڕۆک دەخنکێنێت.
ئاخۆ نازانم زاڵی شەوە یان شەرمەزاری رۆژە
کەوا تاریکی رووی زەوی داپۆشیوە
لەو دەمەی کە دەبێ رووناکی زیندوو ماچی بکات؟

**پیرەمێرد:** ئەوەش شتێکی ناسروشتییە
وەک ئەو کارەی کە کراوە. سێ شەممەی رابردوو
بازێک لە پەڕگەی ئاسمان دەخولایەوە
کوندەبۆیەکی مشککگر راوی کرد و کوشتی.

**رۆز:** هەروا ئەسپەکانی دەنکەن (شتێکی یەگجار سەیر و راستەقینە)
جوان و خۆشڕەو و شای ڕەگەزی خۆیان بوون؛
توندی و کێوی بووینە و لە تەویلە خۆیان راتەکاند و
هەڵیان تیزاند و جووتەیان دەهاویشت، دژی گوێڕایەڵی بوون،

* واتە (حەفتا ساڵ)؛ لە سەردەمی شێکسپیردا ژماردن بەم شێوەیە بوو.

دەتگۆت شەڕ لەگەڵ مرۆڤ دەكەن.

**پیرەمێرد:** دەڵێن یەكتریان خواردووە.

**رۆز:** بەڵێ بە بەرچاوی ئەبڵەقمەوە

وایان كرد.

(ماكدەف دێتە ژوور)

ئەوە (ماكدەف)ی چاك هات –

گەورەم، ئێستا دونیا لە چیدایە؟

**ماكدەف:** بۆچ، خۆت نابینیت؟

**رۆز:** ئایا زانرا كێ ئەو كارە چەپەڵەی كردووە؟

**ماكدەف:** ئەوانەی (ماكبێس) كوشتوونی.

**رۆز:** حەیف، بۆ ئەو رۆژگارە!

چەند چاك خۆیان پیشان دەدا؟

**ماكدەف:** ئەوان هاندرابوون.

هەردوو كوڕی شا، (مالكۆڵم و دۆناڵبێن)

خۆیان دزیوەتەوە و هەڵاتوون؛ ئەوەش

وا دەكات گومان لێكراو بن.

**رۆز:** ئەوەش هەر دژی سروشتە:

حەزی بەرزەفت نەكراو سەرچاوەی

ژیانی خۆی دەخواتەوە!– كەواتە زۆر پێدەچێت

شاییتی بە (ماكبێس) ببڕێت.

**ماكدەف:** ناودێریش كراوە و چۆتە (سكۆن)



War with mankind.

**OLD MAN:**

'Tis said they eat each other.

**ROSSE:**

They did so; to the amazement of mine eyes,
That look'd upon't-

*[Enter Macduff.]*

Here comes the good Macduff.-
How goes the world, sir, now?

**MACDUFF:**

Why, see you not?

**ROSSE:**

Is't known who did this more than bloody deed?

**MACDUFF:**

Those that Macbeth hath slain.

**ROSSE:**

Alas, the day!
What good could they pretend?

**MACDUFF:**

They were suborned:
Malcolm and Donalbain, the king's two sons,
Are stol'n away and fled; which puts upon them
Suspicion of the deed.

**ROSSE:**

'Gainst nature still:
Thriftless ambition, that wilt ravin up
Thine own life's means!--Then 'tis most like,
The sovereignty will fall upon Macbeth.

**MACDUFF:**

He is already named; and gone to Scone

To be invested.

**ROSSE:**

Where is Duncan's body?

**MACDUFF:**

Carried to Colme-kill,
The sacred storehouse of his predecessors,
And guardian of their bones.

**ROSSE:**

Will you to Scone?

**MACDUFF:**

No, cousin, I'll to Fife.

**ROSSE:**

Well, I will thither.

**MACDUFF:**

Well, may you see things well done there,--adieu!--
Lest our old robes sit easier than our new!

**ROSSE:**

Farewell, father.

**OLD MAN:**

God's benison go with you; and with those
That would make good of bad, and friends of foes!

[Exeunt.]



تا بکرێتە شا.

**رۆز:** تەرمی (دەنکەن ) لە کوێیە؟

**ماکدەف:** بردرا بۆ (کۆڵمی - کێل)
که گڵکۆی پیرۆزی باو و باپیرانیان و
پاسەوانی ئێسک و پرووسکیانە.

**رۆز:** ئایا دەچیت بۆ (سکۆن)[٩]؟

**ماکدەف:** نەخێر ، ئامۆزا، من دەچمە (فایف).

**رۆز:** چاکە، ڕەنگە شتی باشتر لەوێ بدینی:- خواحافیز!-
بەڵام دەترسم جلە کۆنەکانمان لە نوێکانمان ئاسانتر بە بەرمان بکەن.

**رۆز:** خواحافیز، بابە.

**پیرەمێرد:** خواتان لەگەڵ؛ لەگەڵ هەموو ئەوانەی بێ مەبەست
خراپ دەکەنە چاک و دوژمن دەکەنە دۆست.

(دەڕۆن)

(٩) سکۆن: شارێکی شاهانەی کۆنە، زۆر پێ دەچێت پایتەختی شانشینی (بێکێت)ی جاران بووبێت و دوو میل لە سەرووی (بیرث)ەوەیە لە سکۆتلەندا. (بەردی چارەنووس) لەوێیە و شاکانی سکۆتلەندا کاتی تاج لەسەرنان دادەنیشن. وا بڕوا دەکرێت ئەمە (دۆشەکی یاقوب) بێت کە لە تەوڕاتدا ناوی هاتووە، شا ئیدواردی یەکەم ساڵی ١٢٩٦ ئەوەی لە کلێسای (وێست مینستەر) لە (لەندەن) دزیبوو.

## دیمەنی یەکەم

### فۆریس. ژوورێکی ناو کۆشک

(بانکۆ) دێتە ژوورەوە

**بانکۆ:** ئێستا بە خۆت هەموو شتێکیت

شا و کۆدۆ و گلێمسیت،

وەک چۆن ژنانی چارەنووس بەڵێنیان پێ دایت، بەڵام دەترسم

یەگجار بە خراپی بە ئەنجامت گەیاندبێت، کەچی گوترا

بۆ نەوەکانت نامینێتەوە؛

من خۆم دەبمە ڕەگ و باوکی

کۆمەڵە شایەک، ئەگەر ڕاست بکەن

(وەک چۆن قسەکانیان بەسەر تۆوە -ماکبێس- دەدرەوشێنەوە)،

بۆچ ئەو ڕاستییانەی لەگەڵ تۆ نواندیان

نەبنە سروش بۆ منیش و

ئاواتم بۆ بهێننە دی؟ بەڵام ، کڕبە، بەسە[١٠].

(دەنگی کەڕنا دێ. ماکبێس وەک شا و خاتوو ماکبێس

وەک شاژن دێتە ژوور؛ لینکۆس، ڕۆز، گەورەپیاوان و

یاوەرەکان بە دوایانەوەن).

---

(١٠) لە کتێبی (هۆلنشید)دا کە شێکسپیر چیرۆکی ئەو شانۆییەی لێ وەرگرتووە (بانکۆ)ش لە تاوانی کوشتنی شادا بەشدارە. بەڵام لەبەرئەوەی شا (جێمزی یەکەم) کە نەوەی بانکۆ بوو چەند ساڵێک پێش نووسینی ئەو شانۆییە هاتە سەر تەختی سکۆتلەندا و ئینگلتەرا بۆیە شێکسپیر ناچار بوو بەڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتە بکات. هەروا لەبەر چەند هۆیەکی درامی شێکسپیر بانکۆ و ماکبێس دەکاتە دوو کەسی دژ بە یەک و تەنها ماکبێس و خانمەکەی لە تاوان بەشدارن، چا لەو قسەیەی بانکۆ دیارە کە ئەو هەموو شتێک لەبارەی تاوانەکەوە دەزانێت، بەڵام لەبەر ئارەزووی خۆی نایدرکێنێت.



## Scene I

**Forres. A Room in the Palace.**

[Enter Banquo.]

**BANQUO:**

Thou hast it now, King, Cawdor, Glamis, all,
As the weird women promised; and, I fear,
Thou playedst most foully for't; yet it was said
It should not stand in thy posterity;
But that myself should be the root and father
Of many kings. If there come truth from them,
(As upon thee, Macbeth, their speeches shine),
Why, by the verities on thee made good,
May they not be my oracles as well,
And set me up in hope? But hush; no more.

*[Sennet sounded. Enter Macbeth as King;
Lady Macbeth as Queen; Lennox, Ross,
Lords, and Attendants.]*

**ماکبێس:** ئەوەتا میوانی سەرەکیمان.

**خاتوو ماکبێس:** گەر لە بیر بکرابوایە

دەبووە کەلێنێک لە شایلۆغانەکەمان و

یەکجار ناشایستەش دەبوو.

**ماکبێس:** (بۆ بانکۆ) ئەمشەو ئاهەنگێکی شاهانەمان دەبێت، گەورەم،

جا من داوات لێ دەکەم ئامادەبیت.

**بانکۆ:** با خاوەن شکۆتان

فەرمانم پێ بکات، ئەرکی منیش

بە پەیوەستێکی یەگجار توند

هەتا هەتایە بە ئێوەوە بەستراوەتەوە.

**ماکبێس:** ئەمڕۆ پاش نیوەڕۆ دەکەوێتە ڕێ؟

**بانکۆ:** بەڵێ گەورەم.

**ماکبێس:** وانەبووایە حەزمان دەکرد لە کۆبوونەوەی ئەمڕۆدا

گوێمان لە ئامۆژگارییەکانت ببوایە

(کە هەم بە جێ و هەم بە سوودن)، بەڵام با سبەی بێت.

زۆر دوور دەڕۆیت؟

**بانکۆ:** گەورەم ئەوەندە دوور دەڕۆم

تا نانی ئێوارەم پێ دەچێت. ئەگەر ئەسپەکانم خێرا نەڕۆن

دەبێ یەک دوو سەعاتیش

لە تاریکی شەو وەبەر بدەم.

**ماکبێس:** لەو شایلۆغانە دوانەکەویت.



**MACBETH:**

Here's our chief guest.

**LADY MACBETH:**

If he had been forgotten,

It had been as a gap in our great feast,

And all-thing unbecoming.

**MACBETH:**

*[To Banquo]* To-night we hold a solemn supper, sir,

And I'll request your presence.

**BANQUO:**

Let your highness

Command upon me; to the which my duties

Are with a most indissoluble tie

For ever knit.

**MACBETH:**

Ride you this afternoon?

**BANQUO:**

Ay, my good lord.

**MACBETH:**

We should have else desired your good advice,

(Which still hath been both grave and prosperous)

In this day's council; but we'll take to-morrow.

Is't far you ride?

**BANQUO:**

As far, my lord, as will fill up the time

'Twixt this and supper: go not my horse the better,

I must become a borrower of the night,

For a dark hour or twain.

**MACBETH:**

Fail not our feast.

**BANQUO:**

My lord, I will not.

**MACBETH:**

We hear our bloody cousins are bestowed
In England and in Ireland; not confessing
Their cruel parricide, filling their hearers
With strange invention: but of that to-morrow;
When therewithal we shall have cause of state
Craving us jointly. Hie you to horse: adieu,
Till you return at night. Goes Fleance with you?

**BANQUO:**

Ay, my good lord: our time does call upon's.

**MACBETH:**

I wish your horses swift and sure of foot;
And so I do commend you to their backs.
Farewell.--

*[Exit Banquo.]*

*[To the Lords]* Let every man be master of his time
Till seven at night; to make society
The sweeter welcome, we will keep ourself
Till supper time alone: while then, God be with you!
*[Exeunt Lady Macbeth, Lords, Ladies, etc.]*
*[To an Attendant]* Sirrah, a word with you: attend those men
Our pleasure?

**ATTENDANT:**

They are, my lord, without the palace gate.

**MACBETH:**

Bring them before us. *[Exit Attendant.]*- To be thus is nothing;
But to be safely thus:--our fears in Banquo.



**بانكۆ:** گەورەم، دواناكەوم.

**ماكبێس:** بیستوومە ئامۆزا خوێن ڕێژەكانمان
لە ئینگلتەرا و ئێرلەندا گیرساونەتەوە؛ پێ لە تاوانی
دڵڕەقانەی باوک كوژیان نانێن و گوێی خەڵک
پڕی درۆو دەلەسەی سەیر دەكەن. بەڵام سبەی لەم بارەیەوە و
لە بارەی چەند بابەتێكی وڵاتمان كە زۆر پێویستی بە هەردووكمانە
دەدوێین. خێرا سواری ئەسپەكەت بە،
تا شەو دەگەڕێیتەوە خوا حافیز. فلینس لەگەڵت دێت؟

**بانكۆ:** بەڵێ سەروەری چاكم؛ ئەو كارە پێویستی بەهەردووكمانە.

**ماكبێس:** هیوادارم ئەسپەكانتان خۆش بڕۆن، هەنگاوان توند هەڵێنن
پێم خۆشە لەسەر پشتیان خۆش رابوێرن.
خوا حافیزتان بێ،
(بانكۆ دەڕوات)
(بۆ گەورە پیاوان) تا سەعات حەوتی شەو هەركەسە
سەربەستە بۆ خۆی: تا یەكدی دیتنەوەمان خۆش و
بەلەزەتتر بێت، ئێمە تا وەختی شێو بە تەنیا دەبین،
تا ئەوكات خواتان لەگەڵ.
(خاتوو ماكبێس و گەورەپیاوان و ئەوانی دی دەڕۆن)
(بۆ پاكارێک) كوڕە، بزانە، با ئەو پیاوانە چاوەڕێم بن
تا ماوەم دەبێت بیانبینم؟

**پاكارەكە:** گەورەم ئەوان لەو دیوی دەرگای كۆشكەوەن.

**ماكبێس:** بیانهێنە لامان. (پاكارەكە دەڕوات)– ئەوها بیت هیچ نییە،
بەڵام گرینگ ئەوەیە بەسەلامەتی وابیت.– ترسی ئێمە لە بانكۆ

زۆر قووڵ و ڕەگاژۆیە، ئاکاری بەرز و بڵندی شایانەی
وا دەکات لێی بترسین؛ ئەو زۆر بوێر و نەترسە،
ئازایەتی کەسێتی و هۆشمەندی ئەو،
لەگەڵ ئەو ژیرییەی کە رابەری ئەو ئازایەتییەی دەکات
وای لێ دەکات بە سەلامەتی بجوولێتەوە. جگە لەو
کەسی دی نییە لێی بترسم، هەروا لەبەرامبەر ئەودا
بیر و تواناییم لاوازن و هەردەڵێی
هی (مارک ئەنتۆنی)یە لە بەرامبەر قەیسەردا؛ ئەو لەجادووگەرەکانی راخوڕی
کە یەکەم جار ناوی شایان پێم بەخشی
داوای لێ کردن قسەی لەگەڵ بکەن، ئینجا پێغەمبەرئاسا
وەک باوکی کۆمەڵێک شا سڵاویان لێی کرد،
ئەوان تانجێکی بێ بەریان لەسەرم نا و
داردەستێکی زڕکیان لە چنگم نا،
پاشان بە دەستی یەکێکی لەخۆم نەبوو لەچنگم دەربێنرێ،
هیچ کوڕێکم نییە تا جێم بگرێتەوە. ئەگەر وابێت
مێشکی خۆم بۆ نەوەکانی بانکۆ پیس کردووە؛
بۆ ئەوانیش (دەنکەن)ی بەخشندەم کوشت؛
تەنها بۆ ئەوان جامی هێمنی خۆمم پڕ تاڵێتی
کردووە، گەوهەری سەرمەدی خۆم
بە دوژمنی سەرجەمی مرۆڤ(*) بەخشی
تا نەوەکانی بانکۆ بکەمە شا!
لەگەڵ ئەوەشدا، دەی چارەنووس وەرە مەیدان و
تا سەر یارم بە!– کێ لەوێیە؟–
(پاکارەکە لەگەڵ دوو پیاوکوژ دێتە ژوور)
(بۆ پاکارەکە) ئێستا، برۆ لای دەرگاو لەوێ بە تا بانگت دەکەم –
(پاکارەکە دەڕوات)

(*) مەبەستی لە شەیتانە.



Stick deep; and in his royalty of nature
Reigns that which would be feared: 'tis much he dares;
And, to that dauntless temper of his mind,
He hath a wisdom that doth guide his valour
To act in safety. There is none but he
Whose being I do fear: and under him,
My genius is rebuked; as, it is said,
Mark Antony's was by Caesar. He chid the sisters
When first they put the name of king upon me,
And bade them speak to him; then, prophet-like,
They hailed him father to a line of kings:
Upon my head they placed a fruitless crown,
And put a barren sceptre in my gripe,
Thence to be wrenched with an unlineal hand,
No son of mine succeeding. If't be so,
For Banquo's issue have I filed my mind;
For them the gracious Duncan have I murdered;
Put rancours in the vessel of my peace
Only for them; and mine eternal jewel
Given to the common enemy of man,
To make them kings, the seed of Banquo kings!
Rather than so, come, fate, into the list,
And champion me to the utterance!--Who's there?--
*[Re-enter Attendant, with two Murderers.]*
*[To the Attendant]* Now go to the door, and stay there till we call.
*[Exit Attendant.]*

(بۆ پیاو کوژەکان) دوێنێ نەبوو پێکەوە قسەمان کرد؟

**یەکەم پیاو کوژ:** وابوو، ئەی خاوەن شکۆ.

**ماکبێس:** باشە. دەی ئێستا

بیرتان لە قسەکانم کردۆتەوە؟ دەزانن

ئەو بوو لەمەوپێش ئێوەی

لەو بارە پڕ کوێرەوەرییەدا هیشتبۆوە. ئێوەش واتان دەزانی

ئێمەی بەستەزمان بووین. لە کۆبوونەوەی رابردوودا

من ئەوەم بۆتان سەلماند و بە بەڵگە بۆتانم ڕوون کردەوە

کە چۆن ئێوە هەڵخەڵەتابوون: چۆن ڕێگای بەرزبوونەوەتان

لێ گیرابوو و کێ بوو ئەو کارانەی بەجێ دەگەیاند؛

گەر مرۆڤ کەمێک مێشک و گیانی هەبێ

دەتوانێ بڵێ (بانکۆ وای کرد.)

**یەکەم پیاو کوژ:** تۆ ئەوت بۆ ئێمە ئاشکرا کرد.

**ماکبێس:** من وام کرد و لەوە پتریشم کرد، ئەوەش ئێستا

ئامانجی دووەم کۆبوونەوەمانە. ئایا ئێوە

ئەوەندە دڵفراوانن و ئارامیتان بەسەر سروشتتاندا زاڵە

لێ بگەڕێن ئەمە وا بڕوات؟ ئایا ئێوە

ئەوەندە بەدینن نوێژ بۆ ئەو پیاوە باشە و نەوەکانی بکەن،

کە بە دەستە قورسەکانی ئێوەی لە گۆڕ پەستاوە و

مناڵەکانی ئێوەی هەتا هەتایە کردۆتە دەرۆزەکەر؟

**یەکەم پیاو کوژ:** ئێمە پیاوین گەورەم.

**ماکبێس:** بەڵێ تەنها لە لیستەدا ئێوە بە پیاو نووسراون؛

وەک چۆن تاژی و بۆرەتاژی و سەگی دووڕەگ و قوتەسەگ و سەگی بەڕەڵا

سەگی تووک زبرو سەگی دەوئاوان و سەگی گورگەمێش و نیمچە سەگ



Was it not yesterday we spoke together?

**FIRST MURDERER:**

It was, so please your highness.

**MACBETH:**

Well then, now

Have you considered of my speeches? Know

That it was he, in the times past, which held you

So under fortune; which you thought had been

Our innocent self. This I made good to you

In our last conference, passed in probation with you

How you were borne in hand, how crossed, the instruments,

Who wrought with them, and all things else that might

To half a soul and to a notion crazed

Say, "Thus did Banquo."

**FIRST MURDERER:**

You made it known to us.

**MACBETH:**

I did so; and went further, which is now

Our point of second meeting. Do you find

Your patience so predominant in your nature,

That you can let this go? Are you so gospelled,

To pray for this good man and for his issue,

Whose heavy hand hath bowed you to the grave,

And beggared yours forever?

**FIRST MURDERER:**

We are men, my liege.

**MACBETH:**

Ay, in the catalogue ye go for men;

As hounds, and greyhounds, mongrels, spaniels, curs,

Shoughs, water-rugs, and demi-wolves are clept

All by the name of dogs: the valued file
Distinguishes the swift, the slow, the subtle,
The house-keeper, the hunter, every one
According to the gift which bounteous nature
Hath in him closed; whereby he does receive
Particular addition, from the bill
That writes them all alike: and so of men.
Now, if you have a station in the file,
Not i' the worst rank of manhood, say it;
And I will put that business in your bosoms,
Whose execution takes your enemy off;
Grapples you to the heart and love of us,
Who wear our health but sickly in his life,
Which in his death were perfect.

**SECOND MURDERER:**

I am one, my liege,
Whom the vile blows and buffets of the world
Have so incensed that I am reckless what
I do to spite the world.

**FIRST MURDERER:**

And I another,
So weary with disasters, tugged with fortune,
That I would set my life on any chance,
To mend it or be rid on't.

**MACBETH:**

Both of you
Know Banquo was your enemy.

**BOTH MURDERERS:**

True, my lord.



هەموویان بەناوی سەگ ناونراون، ئەو لیستە بەراوردکارییە بایەخدارە
خێرا و سست و ناسک و ماڵپارێز و راوکەر هەریەکە
بەو بەهرەیەی سروشتی بەخشندە پێی داون لێک جیا دەکاتەوە.
بەمەش هەر یەکە لای ئێمە ناوێکی سەربار بەپێی ئاکاری خۆی
وەردەگرێت، بەڵام ئەو لیستەیە هەموویان بەجۆرێک ناو دەبات،
هەمان شتیش بەرامبەر مرۆڤ راستە.
ئێستا ئەگەر شوێنێکتان لە ناو ئەو لیستەیەدا هەیە و
لە خراپترین پلەی پیاوەتیدا نین، بیڵێن!
منیش ئەو کارە دەخەمە ناو سینەتان و
بە جێبەجێ کردنی دوژمنەکەتان لە ناو دەبات،
ئێوەش بە دڵ و دەروونمانەوە دەنووسێنێت و
تا ئەو لە ژیاندا مابێت ناتەواو و نەساغە و
بە مردنی چاک دەبێتەوە.

**دووەم پیاوکوژ:** گەورەم من یەکێکم
کە لەقەو شەقی پیسی زەمانە
وای رەتاندووم بێ باک بم
لەوەی دەیکەم بۆ تۆڵەسەندنەوە لە دونیا.

**یەکەم پیاو کوژ:** منیش یەکێکی دیم
کارەسات وای پرووکاندووم و بەخت وای لێ توند کردووم
کە ژیانی خۆم دەخەمە سەر هەر رێکەوتێک
تا چاک ببمەوە یان لێ ی رزگاربم.

**ماکبێس:** هەردووکتان دەزانن
کە (بانکۆ) دوژمنتانە.

**هەردوو پیاوکوژ:** ڕاستە، گەورەم.

**MACBETH:**

So is he mine; and in such bloody distance,
That every minute of his being thrusts
Against my near'st of life; and though I could
With barefaced power sweep him from my sight,
And bid my will avouch it, yet I must not,
For certain friends that are both his and mine,
Whose loves I may not drop, but wail his fall
Who I myself struck down: and thence it is
That I to your assistance do make love,
Masking the business from the common eye
For sundry weighty reasons.

**SECOND MURDERER:**

We shall, my lord,
Perform what you command us.

**FIRST MURDERER:**

Though our lives--

**MACBETH:**

Your spirits shine through you. Within this hour at most,
I will advise you where to plant yourselves;
Acquaint you with the perfect spy o' the time,
The moment on't; for't must be done to-night
And something from the palace; always thought
That I require a clearness; and with him,
(To leave no rubs nor botches in the work)
Fleance his son, that keeps him company,
Whose absence is no less material to me
Than is his father's, must embrace the fate
Of that dark hour. Resolve yourselves apart:
I'll come to you anon.



**ماكبێس:** دوژمنی منیشە؛ هەروا كینەیەكی وا توندم لە دڵدایە
كە هەر خولەكێكی مانی ناو هەناوم دەكۆڵێت؛
هەر چەندە بە ئاشكرا دەتوانم بە هێز لەبەر چاوم بیسڕمەوە و
بڵێم مافی خۆم بوو و وابكەم، كەچی لەبەر خاتری
دۆست و برادەرانی هەردووكمان نابێ وابكەم
چونكە نامەوێ خۆشەویستییان بدۆڕێنم. سەرەڕای ئەوەش
دەبێ بلاڵێمەوە بۆ مەرگی ئەو كەسەی خۆم دەیكوژم.
ئینجا بۆیە لە یارمەتی ئێوەدا خۆشەویستی دەبینم و
لەبەر گەلێ هۆی گرنگ ئەو كارە
لە چاوی هەموو خەڵك دەشارمەوە.
**دووەم پیاوكوژ:** گەورەم فەرمانت چی بێت
جێبەجێ دەكەین.
**دووەم پیاوكوژ:** هەر چەندە ژیانیشمان –
**ماكبێس:** ڕۆحتان لە جەستەتانا دەدرەوشێتەوە. هەر لەو كاتژمێرە درەنگەدا
ئامۆژگاریتان دەكەم لە كوێ خۆ مەڵاس بدەن و
لە ڕێی ڕاستترین سیخوڕِ باشترین كات و ساتتان پێ دەڵێم
چونكە دەبێ ئەو كارە هەر ئیمشەو بكرێت و
لە جێیەكی كەمێك دوور لەم كۆشكەو هەمیشە ئەوەتان لەبیر بێ
من دەمەوێ لەو كارە بە پاكی دەربچم: نابێ لەگەڵ ئەودا
(هیچ كەم و كوڕی و شپرێوییەك لەو كارە) بە جێ بهێڵرێ،
(فلینس)ی كوڕیشی كە لەگەڵیدایە
نەمانی ئەو بۆ من لە هی باوكی
كەمتر نییە، دەبێ ڕووبەڕووی چارەنووسی
ئەو ساتە تارە ببێتەوە. هەر كەسە و بڕیاری خۆتان بدەن،
هەر ئێستا دێمەوە لاتان.

**دووەم پیاوکوژ:** گەورەم ئێمە بڕیاری خۆمان داوە.

**ماکبێس:** هەر ئێستا دەنێرمە دواتان: لە ناوەوە بمێننەوە–

(پیاوکوژەکان دەڕۆن)

رۆحت فڕیوە و کۆتاییتە ئەی (بانکۆ)

گەر بە هەشتی بێ، بیدۆزەوە هەر ئەمشۆ.

(دەڕوات)



**BOTH MURDERERS:**

We are resolved, my lord.

**MACBETH:**

I'll call upon you straight: abide within.

*[Exeunt Murderers.]*

It is concluded: Banquo, thy soul's flight,

If it find heaven, must find it out to-night.

[Exit.]

## دیمەنی دووەم

هەمان شوێن. ژوورێکی دی ناو قەڵا

خاتوو ماکبێس و تەیانێک دێنە ناوەوە.

**خاتوو ماکبێس:** ئەرێ (بانکۆ) لە دەربار ڕۆیشتووە؟

**تەیان:** بەڵێ، خانم، بەڵام ئیمشەو دێتەوە.

**خاتوو ماکبێس:** بە شا بڵێ دەمەوێ بۆ چەند قسەیەک

کەمێک لە کاتی وەرگرم.

**تەیان:** باشە، خانم.

(دەڕوات)

**خاتوو ماکبێس:** هیچمان نەکرد، هەمووی دۆڕا

ئەوەی ئاواتمان بوو پووچ دەرچوو،

چاکترە ئەو شتە بیت کە تێکی دەشکێنیت

لەوەی بەتێکشکاندنی بکەویتە ناو بەختەوەری گوماناوی.

(ماکبێس دێتە ژوور)

ئێستا چۆنیت گەورەم؟ بۆ وا تەنیایت،

تاڵترین بیر و ئەندۆ هاوڕێتن و

ئەو بیرانەی دەبوا مردبان سەری تێ کردوویت و

بیریان لێ دەکەیتەوە؟ ئەو شتانەی بێ چارەن

پێویستە لە بیربکرێن: ئەوەی بوو بوو.

**ماکبێس:** ئێمە مارەکەمان بریندار کرد و نەمانکوشت:



## Scene II

**The same. Another Room in the Palace.**

*[Enter Lady Macbeth and a Servant.]*

**LADY MACBETH:**

Is Banquo gone from court?

**SERVANT:**

Ay, madam, but returns again to-night.

**LADY MACBETH:**

Say to the king, I would attend his leisure
For a few words.

**SERVANT:**

Madam, I will.

*[Exit.]*

**LADY MACBETH:**

Nought's had, all's spent,
Where our desire is got without content:
'Tis safer to be that which we destroy,
Than, by destruction, dwell in doubtful joy.

*[Enter Macbeth.]*

How now, my lord! why do you keep alone,
Of sorriest fancies your companions making,
Using those thoughts which should indeed have died
With them they think on? Things without all remedy
Should be without regard: what's done is done.

**MACBETH:**

We have scotched the snake, not killed it;

چاک دەبێتەوەو وەک خۆی لێ دێتەوە؛ کەچی رقی بەستەزمانمان
لەبەردەم ترسی ددانی جارانی دەمێنێتەوە.
با هەموو شتێک لێک بترازێت، زەوی و ئاسمان تێک و پێک بچن
بەرلەوەی ئێمە لە ترسدا بژین و
لە نێو ئازاری ئەو خەونە ترسناکانەی شەوانە
راماندەچڵەکێنن بخەوین. باشترە لەگەڵ ئەو مردووانە بین
کە خامۆشمان کردن بۆ وەدەستهێنانی ئەو پلە و پایانە
لەوەی لەسەر حیسابی ئازاری مێشک
لە شادییەکی بێ ئارامدا بخەوین. (دەنکەن) لەگۆڕی خۆیدایە
ئێستا دوای ژیانێکی چالاک و گەرم و گوڕ باش دەخەوێت؛
خەیانەت خراپترین کاری خۆی کرد: نە شمشێر و نە ژەهر،
نە کینەی ناوخۆیی، نە لەشکری دەرەوە و
نە هیچی دی لەوانە پێی دەگەن.

**خاتوو ماکبێس:** وەرە؛

سەروەری دڵفراوانم، کەمێک ئاگات لە رەنگ و رووی گۆڕاوت بێت.
ئیمشەو لە ناو میوانەکانت دڵخۆش و بەکەیف بە.

**ماکبێس:** وا دەکەم، گیانەکەم : بۆیە حەز دەکەم تۆش وابیت:

ئاگات لە (بانکۆ) بێت،
بە چاو و بەدەم لەگەڵ ئەو بە پایەبەرزی بجوولێوە،
وا پێ دەچێت ئێستا جێگامان لەق بێت
بۆیە دەبێ رۆمەتی خۆمان لە جۆگەلەی کوزکێشیدا بشۆین و
روخسارمان بکەینە دەمامکی دڵمان و
ڕاستی خۆمانی پێ بشارینەوە.

**خاتوو ماکبێس:** دەبێ تۆ واز لەو بیرانە بێنیت.

**ماکبێس:** ئۆهـ، ژنە ئازایەکەم، مێشکم پڕی بیری دوپشکینە



She'll close, and be herself; whilst our poor malice
Remains in danger of her former tooth.
But let the frame of things disjoint. Both the worlds suffer,
Ere we will eat our meal in fear, and sleep
In the affliction of these terrible dreams
That shake us nightly. Better be with the dead
Whom we, to gain our peace, have sent to peace,
Than on the torture of the mind to lie
In restless ecstasy. Duncan is in his grave;
After life's fitful fever he sleeps well;
Treason has done his worst: nor steel, nor poison,
Malice domestic, foreign levy, nothing,
Can touch him further.

**LADY MACBETH:**

Come on;
Gently my lord, sleek o'er your rugged looks;
Be bright and jovial among your guests to-night.

**MACBETH:**

So shall I, love; and so, I pray, be you:
Let your remembrance apply to Banquo;
Present him eminence, both with eye and tongue:
Unsafe the while, that we
Must lave our honours in these flattering streams;
And make our faces vizards to our hearts,
Disguising what they are.

**LADY MACBETH:**

You must leave this.

**MACBETH:**

O, full of scorpions is my mind, dear wife!

Thou know'st that Banquo, and his Fleance, lives.

**LADY MACBETH:**

But in them nature's copy's not eterne.

**MACBETH:**

There's comfort yet; they are assailable;
Then be thou jocund. Ere the bat hath flown
His cloistered flight, ere to black Hecate's summons,
The shard-borne beetle, with his drowsy hums,
Hath rung night's yawning peal, there shall be done
A deed of dreadful note.

**LADY MACBETH:**

What's to be done?

**MACBETH:**

Be innocent of the knowledge, dearest chuck,
Till thou applaud the deed. Come, seeling night,
Scarf up the tender eye of pitiful day;
And, with thy bloody and invisible hand,
Cancel and tear to pieces that great bond
Which keeps me pale!--light thickens; and the crow
Makes wing to the rooky wood:
Good things of day begin to droop and drowse;
Whiles night's black agents to their preys do rouse.
Thou marvellest at my words: but hold thee still;
Things bad begun make strong themselves by ill.
So, pr'ythee, go with me.

[Exeunt.]



تۆ دەزانیت (بانکۆ) و (فلینس) دەژین.

**خاتوو ماکبێس:** بەڵام ئەوان تاسەر هەر نامێنن.

**ماکبێس:** هێشتا خۆشییەکە لەوەدایە ئەوان بەرهێرشن:

کەواتە دڵخۆش بە. بەرلەوەی شەمشەمەکوێرە بەناو
داڵانەکاندا هەڵفڕێت؛ پێش ئەوەی قالۆنچەی ناو تەپکان
کە بە ڤنگەی خەوبردەیەوە زەنگی باوێشک لێ بدات
بۆ بە دەنگەوەچوونی بانگەوازی (هێکێت)ی بەدکار،
کارێکی یەگجار ڕەش وە ئەنجام دەگەیەنرێت.

**خاتوو ماکبێس:** چی دەکرێت؟

**ماکبێس:** گیانەکەم، باشترە هیچ لەو کارە نەزانیت

تا ئەوکاتەی چەپڵەی بۆ لێ دەدەیت. وەرە، ئەی شەوەزەنگ،
پەردەیەکی تاریک بەسەر چاوی ناسکی ڕۆژی بەسەزمان داکێشەو
بە دەستی نادیار و خوێناویت
ئەو ڕێکەوتنە مەزنەی من لە ترسان زەرد دەکات
پووچەڵ بکەوە و پارچە پارچەی بکە!- ڕووناکی تەڵخ و تار دەبێ و
قەلیش بۆ دارستانی شەوانەی باڵداران لە با ڵدەدات،
شتە چاکەکانی ڕۆژ شۆڕ دەبنەوە و وەنەوز دەدەن،
کەچی بوونەوەرە ڕەشەکانی شەو بۆ نێچیرەکانیان رادەبن.
تۆ سەرت لە قسەکانم سووڕماوە، بەڵام ئارامت بێ،
شتێ بە خراپی دەست پێ بکات بە خراپی خۆی بە تێن دەکات
جا تکات لێ دەکەم وەرە.

(دەڕۆن)

## دیمەنی سێیەم

هـەمان شوێن

وێستگەیەک، ڕێگەیەکی لێوە دەچێتە کۆشک.

سێ پیاوکوژ دێنە ناوەوە

**یەکەم پیاو کوژ:** کێ بە تۆی گوت لەگەڵمان بیت؟

**سێیەم پیاوکوژ:** ماکبێس.

**دووەم پیاوکوژ:** پێویست بەوە ناکات گومانی لێ بکەین

له کاتێکدا ئەو باش ئیشی ئێمە دەزانێت و

له هـەموو شتێکی ئێمە ئاگادارە.

**یەکەم پیاو کوژ:** دە کەواتە لەگەڵمان بە.

هێشتا چەند تاڵە ڕووناکییەک لەلای ڕۆژاوا دەبریسکێنەوە:

ئێستا ڕێبواری لە کاروانی شەو بەجێماو خێرا نەقیزە لێ دەدات

تا لە کاتێکی دیاریکراودا بگاتە قۆناغ؛ ئەوەی ئێمەش

چاوەڕێ دەکەین وا نزیک دەکەوێتەوە.

**سێیەم پیاوکوژ:** گوێ شل کەن، گوێم لە دەنگی ئەسپانە.

**بانکۆ** (لە ناوەوە): هـۆو، ڕووناکیمان بۆ پێکەن.

**دووەم پیاوکوژ:** کەواتە خۆیەتی؛ ئەوانی دی

کە لە لیستی داوەت کراواندان

وا لە ناو دەرباردان.

**یەکەم پیاو کوژ:** ئەسپەکانی بەرەو دوا بایاندایەوە.



## Scene III

**The same**

*A Park , with a road leading to the Palace.*

*[Enter three Murderers.]*

**FIRST MURDERER:**

But who did bid thee join with us?

**THIRD MURDERER:**

Macbeth.

**SECOND MURDERER:**

He needs not our mistrust; since he delivers
Our offices and what we have to do
To the direction just.

**FIRST MURDERER:**

Then stand with us.
The west yet glimmers with some streaks of day:
Now spurs the lated traveller apace,
To gain the timely inn; and near approaches
The subject of our watch.

**THIRD MURDERER:**

Hark! I hear horses.

**BANQUO:**

[Within.] Give us a light there, ho!

**SECOND MURDERER:**

Then 'tis he; the rest
That are within the note of expectation
Already are i' the court.

**FIRST MURDERER:**

His horses go about.

**سێیەم پیاوکوژ:** نزیکەی میلێک لێمان دوورە، بەڵام ئەویش
وەک هەموو کەسێکی دی لێرەوە تا بەر دەرگەی
کۆشک بە پێ دەڕوات.
(بانکۆ دێ و فلینس مەشخەڵێکی لە دەستە)
**دووەم پیاوکوژ:** ڕۆناکی، ڕۆناکی.
**سێیەم پیاوکوژ:** خۆیەتی .
**یەکەم پیاو کوژ:** ئامادەبن.
**بانکۆ:** (بۆ فلینس) ئەمشەو دەبارێت.
**یەکەم پیاو کوژ:** با ببارێت[١١].
(پیاوکوژی یەکەم ڕووناکی دەکوژێنێتەوە و ئەوانی دی
هەڵدەکوتنە سەر بانکۆ)
**بانکۆ:** ئۆ، خیانەت! ئەی (فلینس)ی ئازیز ڕاکە، ڕاکە، ڕاکە، ڕاکە!
تۆ ڕەنگە تۆڵەم بکەیتەوە–(بۆ پیاو کوژەکە) ئەی نامەرد!
(دەمرێت، فلینس ڕادەکات)
**سێیەم پیاوکوژ:** کێ بوو ڕووناکی کوژاندەوە؟
**یەکەم پیاو کوژ:** وا دانەنرابوو؟
**سێیەم پیاوکوژ:**تەنها یەکێک کوژرا، کوڕەکەی ڕایکرد.
ئێمە چاکترین بەشی
**دووەم پیاوکوژ:**کارەکەمان لە دەست چوو.
**یەکەم پیاو کوژ:** باشە، بابڕۆین و بڵێین چیمان کرد.
(دەڕۆن)

(١١) واتە، با باران ببارێت، هەروا واتە، با لێدان بەسەریدا ببارێت.



**THIRD MURDERER:**
Almost a mile; but he does usually,
So all men do, from hence to the palace gate
Make it their walk.
**SECOND MURDERER:**
A light, a light!
**THIRD MURDERER:**
'Tis he.
**FIRST MURDERER:**
Stand to't.
**BANQUO:**
*[To Fleance]* It will be rain to-night.
**FIRST MURDERER:**
Let it come down.
*[ The First Murder strikes out the light while the others assault Banquo.]*
**BANQUO:**
O, treachery! Fly, good Fleance, fly, fly, fly!
Thou mayst revenge. *[To the Murderer]* O slave!
*[Dies. Fleance escapes.]*
**THIRD MURDERER:**
Who did strike out the light?
**FIRST MURDERER:**
Was't not the way?
**THIRD MURDERER:**
There's but one down: the son is fled.
**SECOND MURDERER:**
We have lost
Best half of our affair.
**FIRST MURDERER:**
Well, let's away, and say how much is done.
*[Exeunt.]*

## Scene IV

**A Room of state in the Palace.**

*A banquet prepared, [Enter Macbeth, Lady Macbeth, Rosse, Lennox, Lords, and Attendants.]*

**MACBETH:**

You know your own degrees: sit down. at first and last,
The hearty welcome.

**LORDS:**

Thanks to your majesty.

**MACBETH:**

Ourself will mingle with society,
And play the humble host.
Our hostess keeps her state; but, in best time,
We will require her welcome.

**LADY MACBETH:**

Pronounce it for me, sir, to all our friends;
For my heart speaks they are welcome.
*[Enter first Murderer to the door.]*

**MACBETH:**

*[To lady macbeth]* See, they encounter thee with their hearts' thanks.--
*[To the Company]* Both sides are even: here I'll sit i' the midst:
Be large in mirth; anon we'll drink a measure
The table round. *[To the Murderer]* There's blood upon thy face.

**MURDERER:**

'Tis Banquo's then.



## دیمەنی چوارەم

دیوەخانێکی گەورە لە کۆشکدا

خوان ئامادەیە، ماکبێس و خاتوو ماکبێس و رۆز و
لینۆکس و لۆرد و پاکارەکانیان دێنە ناوەوە.

**ماکبێس:** ئێوە پلەوپایەی خۆتان دەزانن، لەم سەرەوە
تا ئەوسەر دابنیشین، پڕ بە دڵ بە خێربێن.

**لۆردەکان:** سوپاسی بەڕێزتان دەکەین.

**ماکبێس:** ئێمەش لەگەڵ ئێوە تێکەڵ دەبین و
وەک خانەخوێیەکی خاکەڕا رەفتار دەکەین.
خانمی خانەخوێمان لەسەر کورسی خۆیەتی و دواتر
داوای بەخێرهاتنتانی لێ دەکەین.

**خاتوو ماکبێس:** گەورەم، لە جیاتی من، لە دڵەوە
بەخێرهاتنی هەموو دۆستانمان بکە.
(یەکەم پیاوکوژ دێتە لای دەرگا)

**ماکبێس:** (بۆ خاتوو ماکبێس) بڕوانە، ئەوانیش لە دڵەوە
سوپاست دەکەن.
(بۆ خەڵکەکە): هەردوو بەر وەک یەکن: من لێرە لە ناوەڕاست
دادەنیشم. بە دڵی خۆتان رابوێرن، هەر ئێستا جامێک
بە دەوری مێزەکەدا دەگێڕین. (بۆ پیاو کوژەکە) دەموچاوت بە خوێنە.

**پیاوکوژ:** کەواتە هی بانکۆیە.

**ماکبێس:** باشترە لەسەر روخساری تۆیە نەک لە ناو ئەودا،

فتتان کرد؟

**پیاوکوژ:** گەورەم بە دەستی خۆم کوشتم.

**ماکبێس:** تۆ باشترین پیاوکوژی، بەڵام ئەوەی

(فلینس)ی کوشتبا ئەو چاک بوو: وات کردبا

بێ هاوتا دەبوویت.

**پیاوکوژ:** گەورەی هەرە شکۆدارم

(فلینس) هەڵات.

**ماکبێس:** (بەلابەلایی) ئینجا دەردەکەم لێ دێتەوە: وانەبوایە بێ خەوش بووم،

تەواو بووم وەک مەڕمەڕ، جێگیر وەک کەڤر

بەرەڵا و ئازاد وەک هەوای سەر سەرمان.

کەچی ئێستا دیلی دەستی گومان و ترسانم،

گیراوم و تیاماوم.- (بۆ پیاوکوژ). بەڵام (بانکۆ) ساغە؟

**پیاوکوژ:** بەڵێ، سەروەری پەسندم، بە ساغی لە ناو قۆرتێک راکشاوە

بیست شەقی لە سەری کراوە

بچووکترینیان بەسە بۆ مراندنی.

**ماکبێس:** سوپاس بۆ ئەمە:-

(بەلابەلایی) پیرە مار لەوێ ڕاکشاوە: ئەو کرمەی هەڵاتووە

هەرچەندە ئێستا بێ ددانە.

دوایی سروشت ژەهری لێ دەرسکێنێت (بۆ پیاوکوژ) برۆ!

سبەی بە تەنیا گوێ لە قسەت دەگرم.

(پیاوکوژەکە دەڕوات)



**MACBETH:**

'Tis better thee without than he within.

Is he despatched?

**MURDERER:**

My lord, his throat is cut; that I did for him.

**MACBETH:**

Thou art the best o' the cut-throats; yet he's good

That did the like for Fleance: if thou didst it,

Thou art the nonpareil.

**MURDERER:**

Most royal Sir,

Fleance is 'scaped.

**MACBETH:**

*[Aside]* Then comes my fit again: I had else been perfect;

Whole as the marble, founded as the rock;

As broad and general as the casing air:

But now I am cabined, cribbed, confined, bound in

To saucy doubts and fears. *[To the Murder]* But Banquo's safe?

**MURDERER:**

Ay, my good lord: safe in a ditch he bides,

With twenty trenched gashes on his head;

The least a death to nature.

**MACBETH:**

Thanks for that--

*[Aside]* There the grown serpent lies; the worm that's fled

Hath nature that in time will venom breed,

No teeth for the present.- *[To the Murderer]* Get thee gone; tomorrow

We'll hear, ourselves, again.

*[Exit Murderer.]*

**LADY MACBETH:**

My royal lord,
You do not give the cheer: the feast is sold
That is not often vouched, while 'tis a-making,
'Tis given with welcome. To feed were best at home.
From thence, the sauce to meat is ceremony;
Meeting were bare without it.

**MACBETH:**

Sweet remembrancer!--
Now, good digestion wait on appetite,
And health on both!

**LENNOX:**

May it please your highness sit?

**MACBETH:**

Here had we now our country's honor roof'd,
Were the grac'd person of our Banquo present;
*[The Ghost of Banquo rises, and sits in Macbeth's place.]*
Who may I rather challenge for unkindness
Than pity for mischance!

**ROSSE:**

His absence, Sir,
Lays blame upon his promise. Please't your highness
To grace us with your royal company?

**MACBETH:**

The table's full.

**LENNOX:**

Here is a place reserved, Sir.

**MACBETH:**

Where?

**LENNOX:**

Here, my good lord. *[Macbeth notices the ghost]*



**خاتوو ماکبێس**: سەروەری گەورەم
نۆشت بە کەس نەبەخشی و سفرەی وا بەگیانی کەس ناکەوێت
چونکە دەبوایە ناوناوە بە خێرهاتنیان لێ بکرابوایە،
باشتر بوو لە ماڵ بیانخواردبوایە.
قسەی خۆشی سەر خواردن، لە ماڵ بەدەرەوە، مەزەی خۆشییە،
هاتنە داوەتێ بەبێ ئەم قسانە بۆشە.

**ماکبێس:** ئەی وەبیرەوەهێنی شیرینم–
ئێستا خۆراکێکی چاک چاوەڕێی وە گیان کەوتنتانە؛
نۆشی گیانی هەموو لایەک بێت.

**لینۆکس:** حەز دەکەن بەڕێزتان دانیشن؟

**ماکبێس:** هاتبا (بانکۆ)ی دلۆڤان لێرەبایە، ئێستا هەموو
پیاوە شەرەفمەندەکانی وڵاتمان لەژێر ئەو سایپیتەدا دەبوون.
(تارمایی بانکۆ دێتە ژوور و لە شوێنی ماکبێس دادەنیشێت)
من پتر گلەیی لە بێ وەفاییەکەی دەکەم
لەوەی ڕێکەوت لەگەڵی بێ بەزەیی بووە.

**رۆز:** گەورەم نەهاتنی
گلەیی دێنێتە سەر پەیمانەکەی، حەز دەکەن بەڕێزتان
بە ئامادەبوونی شاهانەتان ناوی خوا لە خواردنەکە بێنن؟

**ماکبێس:** خوان پڕەو جێگا نەماوە.

**لینۆکس:** گەورەم، لێرە شوێنێکت بۆ گیراوە.

**ماکبێس:** لە کوێ؟

**لینۆکس**: لێرە، سەروەری چاکم. (ماکبێس هەست بە تارماییەکە دەکات)

What is't that moves your highness?

**MACBETH:**

Which of you have done this?

**LORDS:**

What, my good lord?

**MACBETH:**

*[To the Ghost]* Thou canst not say I did it: never shake
Thy gory locks at me.

**ROSSE:**

Gentlemen, rise; his highness is not well.

**LADY MACBETH:**

Sit, worthy friends. My lord is often thus,
And hath been from his youth: pray you, keep seat;
The fit is momentary; upon a thought
He will again be well: if much you note him,
You shall offend him, and extend his passion:
Feed, and regard him not.--*[To Macbeth]* Are you a man?

**MACBETH:**

Ay, and a bold one, that dare look on that
Which might appal the devil.

**LADY MACBETH:**

O proper stuff!
This is the very painting of your fear:
This is the air-drawn dagger which, you said,
Led you to Duncan. O! these flaws, and starts,
(Impostors to true fear) would well become
A woman's story at a winter's fire,
Authorized by her grandam. Shame itself!
Why do you make such faces? When all's done,
You look but on a stool.



ئەوە چییە وا لە بەڕێزتان دەکات تێک بچن؟

**ماکبێس:** کێهاتان واتان کردووە؟

**گەورەپیاوان:** چی ، سەروەری چاکم؟

**ماکبێس:** (بۆ تارماییەکە): ناتوانیت بڵێیت من وام لێ کردوویت.
چیدی بسکە خوێناوییەکانت بۆم مەلەقێنەوە.

**رۆز:** جوامێران، هەڵسن، بەڕێزیان ناتەواوە.

**خاتوو ماکبێس:** هاوڕێیانی هێژا ، مەبزوون پیاوەکەم زۆر جار وای لێ دێت و
هەر لە گەنجێتییەوەش وابووە؛ تکایە جێگیر بن؛
لێهاتنەکەی کەم خایەنە؛ لە چاوتروکانێکدا
وەک خۆی لێ دێتەوە. ئەگەر ئێوە زۆر زەینی بدەنێ
خراپتری لێ دەکەن و ئەم سۆزە درێژ دەکەنەوە؛
بخۆن و گوێی پێ مەدەن.– (بۆ ماکبێس) تۆش پیاویت؟

**ماکبێس:** بەڵێ، پیاوێکی ئازاش، ئەوەی ئێستا من
تەماشای دەکەم شەیتانیش لێی دەترسێت.

**خاتوو ماکبێس:** قسەی فش!
ئەوە تەنیا رەنگدانەوەی ترسی خۆتە:
ئەوە ئەو خەنجەرە هەواکێشەیە کە خۆت گۆتەنی
بەرەو (دەنکەن) دەیبردیت. ئۆهـ! ئەو ترس و راچڵەکینانەت
(فشەن لە چاو ترسی راستەقینە) زۆر چاک دەبنە
چیرۆکی بەرئاگردانی زستانەی ئافرەتان
کە داپیرەیان بۆی گێڕابنەوە. شەرمە!
بۆ وا ڕەنگ و ڕوخسارت گۆڕاوە؟
تۆ هەر بە راستی سەیری کورسییەک دەکەیت.

**MACBETH:**

*[To the lords]* Pr'ythee, see there! behold! look! lo!
how say you?--
Why, what care I? *[To the Ghost]* If thou canst nod, speak too.--
*[To the lords]* If charnel houses and our graves must send
Those that we bury back, our monuments
Shall be the maws of kites.

*[Ghost disappears.]:*

**LADY MACBETH:**

What, quite unmanned in folly?

**MACBETH:**

If I stand here, I saw him.

**LADY MACBETH:**

Fie, for shame!

**MACBETH:**

Blood hath been shed ere now, i' the olden time,
Ere humane statute purged the gentle weal;
Ay, and since too, murders have been performed
Too terrible for the ear: the time has been,
That, when the brains were out, the man would die,
And there an end; but now they rise again,
With twenty mortal murders on their crowns,
And push us from our stools. This is more strange
Than such a murder is.

**LADY MACBETH:**

My worthy lord,
Your noble friends do lack you.

**MACBETH:**

*[To lady Macbeth]* I do forget:--
*[To the Lords]* Do not muse at me, my most worthy friends;





**ماکبێس:** (بۆ گەورە پیاوان) تکایە بڕواننە ئێرە! بڕوانن! سەیر کەن! بۆ!
چۆن وا دەڵێیت؟
بۆچ ، باکم بەچییە؟ (بۆ تارماییەکە) مادام سەر دەلەقێنیتەوە، قسەش بکە
(بۆ گەورەپیاوان) ئەگەر مردووخانە و گۆڕەکانمان ناچاربن
نێژراوەکانمان بنێرنەوە،
دەبێ کەلاشمان دەرخواردی کۆلاران بدەین.

(تارماییەکە ون دەبێت)

**خاتوو ماکبێس:** چی! لە گەوجێتیشدا زۆر ناپیاوانەیت؟

**ماکبێس:** لێرە بوەستم دەیبینم.

**خاتوو ماکبێس:** پفاهـ! شەرم بکە!

**ماکبێس:** هەر لە کۆنەوە بەرلەوەی یاسای مرۆڤانە
کۆمەڵگە خاوێن بکاتەوە.
بەڵێ هەر لەو دەمەوە کوشتنی وا کراوە
کە باسکردنی زۆر ترسناکە.
ئەو دەمەی کە مێشک دەپڕژا، مرۆڤ دەمرد و
ئەوەش کۆتایی بوو. کەچی ئێستا لە بیست جێیان
سەر پڕ زام و شەق دەکرێ و راست دەبنەوە،
دێن ئێمەش لەسەر کورسییەکانمان پاڵ پێوە دەنێن؛
ئەمە لە خۆیدا زۆر لە کوشتنەکە سەیرترە.

**خاتوو ماکبێس:** ئەی سەروەری هێژام
هاوڕێ ماقووڵەکانت پێویستییان بە تۆیە.

**ماکبێس:** (بۆ خاتوو ماکبێس): بەڕاستی لە بیرم چوو بوو.–
(بۆ گەورە پیاوان) هاوڕێ هەرە هێژاکانم، سەیرتان پێم نێت،

من ناتەواوییەکی سەیرم هەیە. لەلای ئەوانەی دەمناسن
ئەوە هیچ نییە. وەرن، خۆشەویستی و نۆش بۆ هەمووان،
ئینجا من دادەنیشم.– هەندێ مەیم بدەرێ، پڕی بکە:–
من بۆ خۆشی هەموو مێزەکە دەخۆمەوە،
هەروا بۆ هاوڕێی ئازیزم (بانکۆ) کە لەگەڵمان نییە،
خۆزگە لێرە بوایە.

(تارماییەکە دێتەوە)

بە خۆشی هەمووان و ئەو. ئێمە بۆ خۆشی
هەموو لایەک دەخۆینەوە.

**گەورە پیاوان:** بۆ ئەرک و پەیمانمان!

**ماکبێس:** (بۆ تارماییەکە): لاچۆ! لەبەر چاوم بڕۆ! دەک زەوی بتباتەوە!
ئێسکت بێ مۆخ و خوێنت ساردە.
هیچ مانایەک لە چاوانتا نین
کە لە روخسارتا دەترووسکێنەوە.

**خاتوو ماکبێس:** (بۆ گەورە پیاوان) هاوشانانی خاس،
تەنیا وەک شتێکی ئاسایی بیری لێ بکەنەوە، هەر ئەوەندەیە و بەس،
کەچی خۆشییەکانمان لێ تێک دەدات.

**ماکبێس:** ئەوەی پیاو بیوێرێت بیکات، من پێی دەوێرم:
تۆ وەرە پێش وەک ورچی تیسکنی روسیا،
یان یەکشاخەی زرێدار، یان پڵنگی هەرجانی[١٢]
یاخود بەهەر شێوەیەکی دی جگە لەمە وەرە، دەمارە توندەکانم
هەرگیز نالەرزن: یان ئەگەر زیندوو ببیتەوە و
بوێری داوام لێ بکەیت لە چۆلاییدا شەڕە شمشێر بکەین؛
ئەگەر ئەوسا لەرزیم و لێت نەگەڕام وا بکەیت

(١٢) هەرجانیا، هەرێمێک بوو لە هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسی جاران.



I have a strange infirmity, which is nothing
To those that know me. Come, love and health to all;
Then I'll sit down.--Give me some wine, fill full.--
I drink to the general joy o' the whole table,
And to our dear friend Banquo, whom we miss:
Would he were here!

*[Re- enter Ghost]*

To all, and him, we thirst,
And all to all.

**LORDS:**

Our duties, and the pledge.

**MACBETH:**

*[To the Ghost]* Avaunt! and quit my sight! let the earth hide thee!
Thy bones are marrowless, thy blood is cold;
Thou hast no speculation in those eyes
Which thou dost glare with!

**LADY MACBETH:**

*[To the Lords]* Think of this, good peers,
But as a thing of custom: 'tis no other,
Only it spoils the pleasure of the time.

**MACBETH:**

What man dare, I dare:
Approach thou like the rugged Russian bear,
The armed rhinoceros, or the Hyrcan tiger;
Take any shape but that, and my firm nerves
Shall never tremble: or be alive again,
And dare me to the desert with thy sword;
If trembling I inhabit then, protest me

The baby of a girl. Hence, horrible shadow!
Unreal mockery, hence!

*[Ghost disappears.]*

Why, so;--being gone,
I am a man again.--Pray you, sit still.

**LADY MACBETH:**

*[To Macbeth]* You have displaced the mirth, broke the good meeting,
With most admired disorder.

**MACBETH:**

Can such things be,
And overcome us like a summer's cloud,
Without our special wonder? You make me strange
Even to the disposition that I owe,
When now I think you can behold such sights,
And keep the natural ruby of your cheeks,
When mine are blanched with fear.

**ROSSE:**

What sights, my lord?

**LADY MACBETH:**

*[To the Lords]* I pray you, speak not; he grows worse and worse;
Question enrages him. At once, good-night:--
Stand not upon the order of your going,
But go at once.

**LENNOX:**

Good-night; and better health
Attend his majesty!

**LADY MACBETH:**

A kind good-night to all!

*[Exeunt all Lords and Atendants.]*



ناوم بنێ بووکۆکەی کیژان. لێرە بڕۆ، هەی تارمایی ترسناک!
هەی گاڵتەجاڕی ناڕاستەقینە، بڕۆ!–

(تارماییەکە ون دەبێت)

بۆچ، وا، – ئێستا کە ڕۆیشتیت
بوومەوە پیاو– تکایە، ڕێک دانیشن.

**خاتوو ماکبێس:** (بۆ ماکبێس) تۆ خۆشییەکەت لێ گۆڕین، ئەو کۆبوونەوە
چاکەت بەبێ سەروبەرییەکی سەیر لێ تێکداین.

**ماکبێس:** ئاخۆ دەکرێ شتی وا
بەبێ سەرسوڕمانییەکی تایبەت وەک هەوری هاوینان
بەسەرماندا تێپەڕێت؟ تۆ وام لێ دەکەیت
تەنانەت لە سروشتی خۆشم نامۆبم،
لە کاتێکدا وا دەبینم تۆ دەتوانیت دیمەنی وا بدینی و
سەر کوڵمت بە یاقووتی سوور نەخشابێت،
هەر کە هی من لە ترسان سپی بووە.

**ڕۆز:** چ دیمەنێک، گەورەم؟

**خاتوو ماکبێس:** (بۆ گەورە پیاوان): تکاتان لێ دەکەم، قسە مەکەن،
خراپتر و خراپتری لێ دێت؛
پرسیار تووڕەی دەکات. هەر ئێستا، شەوتان باش :ـ
لە سەر ڕێ و ڕەسمی خواحافیزی مەوەستن ،
هەر یەکسەر بڕۆن .

**لینۆکس:** شەوباش، تەندروستییەکی باشتریش
بۆ خاوەن شکۆ :

**خاتوو مەکبێس:** شەوێکی خۆش بۆ هەمووان .

(گەورە پیاو و پاکاران دەڕۆن)

**MACBETH:**

It will have blood, they say, blood will have blood:
Stones have been known to move, and trees to speak;
Augurs, and understood relations, have
By magot-pies, and choughs, and rooks, brought forth
The secret'st man of blood.--What is the night?

**LADY MACBETH:**

Almost at odds with morning, which is which.

**MACBETH:**

How say'st thou, that Macduff denies his person
At our great bidding?

**LADY MACBETH:**

Did you send to him, sir?

**MACBETH:**

I hear it by the way; but I will send:
There's not a one of them but in his house
I keep a servant fee'd. I will to-morrow,
(And betimes I will) to the weird sisters:
More shall they speak; for now I am bent to know,
By the worst means, the worst. For mine own good,
All causes shall give way: I am in blood
Stepped in so far that, should I wade no more,
Returning were as tedious as go o'er:
Strange things I have in head, that will to hand;
Which must be acted ere they may be scann'd.

**LADY MACBETH:**

You lack the season of all natures, sleep.

**MACBETH:**

Come, we'll to sleep. My strange and self-abuse
Is the initiate fear that wants hard use:--
We are yet but young in deed.

[Exeunt.]



**ماکبێس:** دەڵێن ئەو خوێنی دەوێت ، خوێن خوێنی دەوێت؛
زانراوە بەرد بجمن، دار بدوێن؛
بەختخوێن و پەیوەندەکانی
بە قەلەباچکەو قەل و قەلەڕەش
نهێنیترین پیاوکوژیان دۆزیوەتەوە. شەو چ وەختە ؟

**خاتوو ماکبێس:** لەگەڵ بەیانی شەڕیانە، کەس نازانێ کامیان کامەیە .

**ماکبێس:** رات چییە سە بارەت بە (ماکدەف )
کە خۆی لە فەرمانمان دەدزێتەوە؟

**خاتوو ماکبێس:** گەورەم، بەدواتدا ناردبوو؟

**ماکبێس:** دەینێرم و ئەوەی پێشم گوتی بە ڕێکەوت بیستوومە.
کەسێک نییە لەوان کە من نۆکەرێکم
لە ماڵیان بەکرێ نەگرتبێت. من سبەی
زوو دەچمە لای خوشکانی چارەنووس
ئەوان پترم پێ دەڵێن؛ چونکە من بڕیارم داوە
بە خراپترین ڕێگا خراپترین کاروبار بزانم.
بۆ چاکەی خۆم هەموو ڕێیەک کراوەیەوە. من لەناو خوێن
زوو دوور ڕۆیشتووم کە دەبێ چیدی نەڕۆم،
گەڕانەوەشم وەک چوونەپێش هەر سەختە.
شتی سەیرم لە مێشکدایە کە دەبێ دەستم
بیانکات، پێش ئەوەی بیریان لێ بکەمەوە.

**خاتوو ماکبێس:** بخەوە، تۆ بەهاراتی هەموو سروشتکێت کەمە.

**ماکبێس:** وەرە با بنووین، خۆ خڵەتاندن و نەزانیم
ترسی تازە کارێکە و پێویستە سەختتر خۆی لێ رابێنم،
هێشتا ئێمە لەو کارانەدا نوێین.

(دەڕۆن)

## ديمەنی پێنجەم

### چۆڵاییەکە

گرمەیە ، سێ جادووگەر دێن ( هێکێت) دەبینن.

**یەکەم جادووگەر:** چییە، هێکێت، ئەوە چیتە؟ تووڕە دیاریت.

**هێکێت:** پیرێژنان، ناهەقم کە ئێوەمانان

وا بێ شەرم و چاوقایمن؟ چۆن بوو وێران

لەگەڵ ماکبێس بکەن چەند و چوون

لە مەتەڵ و کاروباری مەرگ بدوون،

منیش کە گەورەی جادووەکانتانم،

پلاندانەری نهێنی گشت خراپەکانتانم،

قەت داوام لێ نەکرا رۆڵی خۆم ببینم،

یان مەزنیی ئەو هونەرەی خۆم بنوێنم؟

لەوەش خراپتر، هەموو ئەوەی کە کردتان

تەنیا بۆ منداڵێکی خۆپەرست و رکن بوو بردتان،

دڵ پڕقین و تۆڵەسێنەو وەک هەر کەسێکی دی،

هەمووی بۆ خۆیەتی و چی بۆ ئێوە لێ نایەتە دی.

بەڵام چاکی دەکەینەوە دەئێستا بڕۆن

لەوێ لەناو قووڵایی رووباری ئەکیرۆن[١٣]

بەیانی بمبیننەوە: ئەو دەگاتە ئەوێ

سەرەنجام و دواڕۆژی خۆی لێتان دەوێ

ئامان و جادووتان ئامادە بکەن،

---

(١٣) ڕووبارێکە لە دۆزەخ.



## Scene V

### The heath

*[Thunder. Enter the three Witches, meeting Hecate.]*

**FIRST WITCH:**

Why, how now, Hecate? you look angerly.

**HECATE:**

Have I not reason, beldams as you are,
Saucy and overbold? How did you dare
To trade and traffic with Macbeth
In riddles and affairs of death;
And I, the mistress of your charms,
The close contriver of all harms,
Was never called to bear my part,
Or show the glory of our art?
And, which is worse, all you have done
Hath been but for a wayward son,
Spiteful and wrathful; who, as others do,
Loves for his own ends, not for you.
But make amends now: get you gone,
And at the pit of Acheron
Meet me i' the morning: thither he
Will come to know his destiny.
Your vessels and your spells provide,

ئەفسوون و چی دی پێویستە ڕێکی بخەن.
من دەچمە ناو با، ئەمشەو وا دەبەمەسەر
بۆ مەبەستێکی ناخۆش و مردەنی ڕێگا دەگرمەبەر:
بەر لە نیوەڕۆ دەبێ کاری مەزن بکرێت،
لە گۆشەی کونجێکی مانگ جێبەجێ بکرێت.
لەوێ دڵۆپێکی هەڵمین زۆر شۆڕبۆتەوە
دەیگرمەوە بەر لەوەی بۆ زەوی بەربێتەوە:
ئەمەش بە فێڵێکی ئەفسوونی دڵۆپێنرایە
ئەجندەی وا دەستکرد لەوی پەیدایە،
بە توانای بەهەڵەبردن و ئەندێشەبازی
بەرەو سەرلێشێوان رایدەکێشینە وازی.
ئەو گاڵتە بە چارەنووس دەکات، فشە دەکا بەمردن و نەمان
ئاواتەکانی پێ گرینگترە لە ژیری و شەرەف و ترسان
ئێوەش باش دەزانن کە لەخۆ دڵنیایی
دوژمنی سەرەکییە بۆ مرۆڤی دونیایی
(گۆرانی (وەرە، وەرە) هتد لە ناوەوە دەگوترێت)
گوێ بگرن! وا بانگم دەکات: لە ڕۆحی گچکەم بڕوانە
لە ناو هەورێکی تەم و مژاوی بۆم چاوەڕوانە.

(دەڕۆن)

**یەکەم جادووگەر:** وەرە، با خێرا کەین: ئەو زوو دێتەوە.

(دەڕۆن)



Your charms, and everything beside.
I am for the air; this night I'll spend
Unto a dismal and a fatal end.
Great business must be wrought ere noon:
Upon the corner of the moon
There hangs a vaporous drop profound;
I'll catch it ere it come to ground:
And that, distilled by magic sleights,
Shall raise such artificial sprites,
As, by the strength of their illusion,
Shall draw him on to his confusion:
He shall spurn fate, scorn death, and bear
His hopes 'bove wisdom, grace, and fear:
And you all know, security
Is mortals' chiefest enemy.
*[Music and song within, "Come away, come away" &c.]*
Hark! I am call'd; my little spirit, see,
Sits in a foggy cloud and stays for me.

*[Exit.]*

**FIRST WITCH:**

Come, let's make haste; she'll soon be back again.

*[Exeunt.]*

# ديمەنی شەشەم

## شوێنیکی سکۆتلەندا

لینۆکس و گەورە پیاوێکی دی دێن.

**لینۆکس**: قسەکانی پێشووم تەنیا بیرێکی بە مێشکتا هێنا،
کە دەکرێ پتر لێک بدرێنەوە: تەنها من دەڵێم،
شتەکان زۆر سەیر ڕوودەدەن. (دەنکەن)ی بەخشندە
ماکبێس بەزەیی پێدا هاتەوە:– بەمەریەم، ئەو مردبوو:–
هەروا (بانکۆ)ی بە ڕاستی ئازا زۆر درەنگ دەگەڕا؛
ڕەنگە گەر حەز بکەیت بتوانی بڵێی (فلینس) کوشتوویەتی،
چونکە (فلینس) رای کرد، پیاو نابێ زۆر درەنگ بگەڕێت.
ئایا کەس بیرناکاتەوە چەند دڕندانە بوو
(مالکۆڵم) و(دۆناڵبێن) باوکی بەخشندەیان
بکوژن؟ وای لەم ڕاستییە نەفرەتییە!
ئای ئەوە (ماکبێس)ی چەند دڵتەنگ کرد! ئەو نەبوو یەکسەر
لە رقێکی ئاییندارانەدا هەردوو تاوانباری
نقوومی خواردنەوە و دونیای خەو پەل پەل کرد؟
ئایا ئەوە مەردانە نەکرا؟ بەڵێ بە ژیرییش کرا؛
چونکە کە ئەوان دەیانگوت لەوە بەرپرس نین
دڵی هەمووان پڕ قین ببوو. بۆیە دەڵێم
ئەو هەموو شتێکی بە چاکی کردووەو من بیر دەکەمەوە
ئەگەر هەردوو کوڕانی (دەنکەن)ی بەردەست بکەوتایە
(خوا نەکات وابێ) تێی دەیگاندن



# Scene VI

## Somewhere in Scotland

*[Enter Lennox and another Lord.]*

**LENNOX:**

My former speeches have but hit your thoughts,
Which can interpret further: only, I say,
Thing's have been strangely borne. The gracious Duncan
Was pitied of Macbeth:--marry, he was dead:--
And the right valiant Banquo walked too late;
Whom, you may say, if 't please you, Fleance killed,
For Fleance fled. Men must not walk too late.
Who cannot want the thought, how monstrous
It was for Malcolm and for Donalbain
To kill their gracious father? damned fact!
How it did grieve Macbeth! did he not straight,
In pious rage, the two delinquents tear
That were the slaves of drink and thralls of sleep?
Was not that nobly done? Ay, and wisely too;
For 'twould have angered any heart alive,
To hear the men deny't. So that, I say,
He has borne all things well: and I do think,
That had he Duncan's sons under his key,
(As, an't please heaven, he shall not,) they should find

What 'twere to kill a father; so should Fleance.
But, peace!--for from broad words, and 'cause he fail'd
His presence at the tyrant's feast, I hear,
Macduff lives in disgrace. Sir, can you tell
Where he bestows himself?

**LORD:**

The son of Duncan,
From whom this tyrant holds the due of birth,
Lives in the English court and is received
Of the most pious Edward with such grace
That the malevolence of fortune nothing
Takes from his high respect. Thither Macduff
Is gone to pray the holy king, upon his aid
To wake Northumberland, and warlike Siward:
That, by the help of these, (with Him above
To ratify the work,) we may again
Give to our tables meat, sleep to our nights;
Free from our feasts and banquets bloody knives;
Do faithful homage, and receive free honours,
All which we pine for now. And this report
Hath so exasperate the king that he
Prepares for some attempt of war.

**LENNOX:**

Sent he to Macduff?

**LORD:**

He did: and with an absolute "Sir, not I,"
The cloudy messenger turns me his back,
And hums, as who should say, "You'll rue the time
That clogs me with this answer."



باوک کوژی مانای چییە؛ (فلینس)یش هەروا.
بەڵام، لەسەرخۆ!– هەر لەبەر قسەی ئاشکراو
نەهاتنە شایلۆغانی زۆردار؛ بیستوومە
کە(ماکدەف) بەر ڕقی ئەو کەوتووە: گەورەم پێم ناڵێی
خۆی لە کوێ ناوە؟

**گەورەپیاو:** کوڕی (دەنکەن )
کە ئەو زۆردارە مافی ژیانی لێ زەوت کردووە،
لەناو دەرباری ئینگلیزیدا دەژیت؛ هەروا لەلایەن
(ئیدوارد)ی هەرە ئاییندار پێشوازی لێ کراوە، بەخۆشییەکی وا
کە بەدبەختی هیچ لە ڕێزوپایەی کەم نەکردۆتەوە، (ماکدەف)
چۆتە ئەوێ و لە پادشای پیرۆز پاڕاوەتەوە
میری (نۆرذەمبەرلەند) یاخی بکات و (سیوارد)ی جەنگاوەری
وەگەڵ بدات و بەیارمەتی (ئەوەی سەر سەرمان(*)) بەڵکو وەک جاران
گۆشت لەسەر مێزمان بێت و خەو بگەڕێتەوە شەوانمان و
چەقۆی خوێناوی لە گۆڤەند و خۆشیمان دوور بخرێتەوە؛
دڵسۆزی راستەقینە بنوێنین و رۆمەتی پیاوی ئازادمان هەبێت،
ئەوەی ئێستا بۆی دەتلێینەوە. جا ئەو هەواڵە
شای ئەوەندە تووڕە کردووە
کە خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات.

**لینۆکس:** ناردییە دوای (ماکدەف)؟

**گەورە پیاو:** ناردی: بە (گەورەم، نایەم)ێکی یەکجاری وەڵامی دایەوە و
پەیامبەری ناڕازی پشتی تێ کردو
بۆڵاندی وەک بڵێت «تۆ ئەم جارە
لەوە پەشیمان دەبیتەوە کە بەو وەڵامە دەستت بەڕوومەوە ناوە»

(*) مەبەست لە خودایە.

**LENNOX:**

And that well might
Advise him to a caution, to hold what distance
His wisdom can provide. Some holy angel
Fly to the court of England, and unfold
His message ere he come; that a swift blessing
May soon return to this our suffering country
Under a hand accursed!

**LORD:**

I'll send my prayers with him.

[Exeunt.]



**لینۆکس**: جا ڕەنگە ئەو زۆر چاک
تێ گەییبێت ئاگای لە خۆبێت و ئەو دوورییە بگرێتەبەر
کە ژیرییەکەی پێی دەبەخشێت. خۆزگە فریشتەیەکی پیرۆز
بۆ دەربای ئینگلتەرا بفڕێت و پێش هاتنەوەی ئەو پەیامەی پێ بگەیەنێت
چونکە ڕەنگە بەم زووانە خێروخۆشییەکی خێرا
بەسەر ئەو وڵاتە ئازار چەشتووەماندا ببارێت
کە لە ژێر دەستێکی نەفەرتی دا دەناڵێنێت!

**گەورە پیاو:** منیش نزای خۆمی پێدا دەنێرم.

(دەڕۆن)

# دیمەنی یەکەم

## ئەشکەوتێکی تاریک

لە ناوەڕاستەوە قازانێکی لەکوڵ هەیە

گرمەیە، سێ جادووگەر دێن.

**یەکەم جادووگەر:** سێ جار پشیلەی جینجرِ میاواندی.

**دووەم جادووگەر:** سێ جار و جارێک ژووژک زرووکاندی.

**سێیەم جادووگەر:** (هاریپەر)[١٤] قیژاندی وەختە وەخت.

**یەکەم جادووگەر:** بە دەوری قازاندا بسووڕێن،

هەناوی ژاراوی تێ بهاوێن:-

بۆقی ژێر تاتە بەردی سارد و سڕ

کەمت بووە سی شەو و سی ڕۆژی پڕ

لەو ماوەیەدا ژاری کوشندە دەردەدا

دەبێ ئەو یەکەمجار بکوڵێ لە قازانی جادوودا.

**هەموویان:** دووقات بکەوە ئەرک و هەوڵ

بسووتێ،بڵقدە، قازان وەرە کوڵ.

**یەکەم جادووگەر:** پارچەی ماری ناو قوڕ،

لەناو مەنجەڵ بکوڵێ بەگڕ:

چاوی قوڕناویلکە و پەنجەی بۆقان،

تووکی شەمشەمەکوێرەو زمانی سەگان،

فلیقەی هەژدەر، چزووی کرمەکۆرە،

لاقی مارمیلکە، باڵی کوندەبۆی ساقەسۆرە،

(١٤) هاریپەر: باڵندەیەکی ئەفسانەییە لە شێوەی ژنێکی باڵدارە.



## Scene I

**A dark cave**

*In the middle, a Caldron Boiling.*

*[Thunder. Enter the three Witches.]*

**FIRST WITCH.**

Thrice the brinded cat hath mewed.

**SECOND WITCH.**

Thrice; and once the hedge-pig whined.

**THIRD WITCH.**

Harpier cries:--"tis time, 'tis time.

**FIRST WITCH.**

Round about the caldron go;
In the poisoned entrails throw.--
Toad, that under cold stone,
Days and nights has thirty-one
Sweltered venom sleeping got,
Boil thou first i' the charmed pot!

**ALL.**

Double, double, toil and trouble;
Fire, burn; and caldron, bubble.

**SECOND WITCH:**

Fillet of a fenny snake,
In the caldron boil and bake;
Eye of newt, and toe of frog,
Wool of bat, and tongue of dog,
Adder's fork, and blind-worm's sting,
Lizard's leg, and howlet's wing,

For a charm of powerful trouble,
Like a hell-broth boil and bubble.

**ALL:**

Double, double, toil and trouble;
Fire, burn; and caldron, bubble.

**THIRD WITCH:**

Scale of dragon, tooth of wolf,
Witch's mummy, maw and gulf
Of the ravined salt-sea shark,
Root of hemlock digged i' the dark,
Liver of blaspheming Jew,
Gall of goat, and slips of yew
Slivered in the moon's eclipse,
Nose of Turk, and Tartar's lips,
Finger of birth-strangled babe
Ditch-delivered by a drab,
Make the gruel thick and slab:
Add thereto a tiger's chaudron,
For th' ingredients of our caldron.

**ALL:**

Double, double, toil and trouble;
Fire, burn; and caldron, bubble.

**SECOND WITCH:**

Cool it with a baboon's blood,
Then the charm is firm and good.

*[Enter Hecate.]*

**HECATE:**

O, well done! I commend your pains;
And everyone shall share i' the gains.



بۆ جادووی کێشەیەکی گەلێ قووڵ
وەک شۆربای خەستی شەیتان بکوڵ.

**هەموویان:** دووقات بکەوە ئەرک و هەوڵ
بسووتێ، بڵقدە، قازان وەرە کوڵ.

**سێیەم جادووگەر:** پوولەکەی ئەژدەها، ددانە گورگ؛
مۆمیای جادووگەران، گەروو و ورگ
هی سەگەماسی دەریای سوێر،
ڕەگی گێژینگ هەڵکەنرابێ لە شەوی کوێر؛
جگەری جوولەکەی گاور؛
زەرداوی بزن، تۆیکڵی داری (یوو)[(١٥)]
لە مانگ گیراندا لێی کەنرابێت زوو،
لووتی تورک، لێوی تەتەر
پەنجەی منداڵی شەوەبەر،
لە قۆرتێکدا سۆزانییەک فڕێی دابێت،
ئەو مەرەگەیە خەست و لیچ کرابێت.
لەگەڵ گەدەی پڵینگ پەلەپەل
لەناو قازاندا دەکەین تێکەڵ.

**هەموویان:** دووقات بکەوە ئەرک و هەوڵ
بسووتێ، بڵقدە قازان وەرە کوڵ.

**دووەم جادووگەر:** سارد بکرێتەوە بە خوێنی مەیموون
ئەوسا چاک و بەتێنە ئەفسوون.

(هێکێت دێتە ژوور)

**هێکێت:** ئۆ، دەست خۆش! ستایشی ماندووبوونتان دەکەم،
هەمووشتان لەو قازانج و سوودە خەنی دەکەم.

(١٥) جۆرە درەختێکی سەوزە لەسەر قەبران دەڕوێت.

جا ئێستا گۆرانی بەو قازانەدا هەڵبڵێن
وەک جنۆکەو پەری لە بازنەدا بسوڕێن
بفروسمێنن ئەو هەمووەی تیایدادەنێن.
(مۆسیقا و گۆرانی "گیانە ڕەشەکان" هتد دەڵێن)

**دووەم جادووگەر:** بە چووزانەوەی لەش و سەرپەنجەم
هەست بە هاتنی شتێکی خراپ دەکەم:– (لە دەرگادان )
ئەی کلۆم بکرێوە
بۆ هەر کەسێک بێ لەوێوە .

(ماکبێس دێتە ژوور)

**ماکبێس:** ئەوە  چییە، ئەی پیرە جادووگەری نیوە شەوان!
ئەوە چی دەکەن؟

**هەموان:** کارێکی بێ ناوونیشان .

**ماکبێس:** ئەتوخواو ئەو کارەی دەیکەن ،
بەو بەهرەیەی کە هەر چۆن بێ بیزانن، وەڵامم بدەنەوە :
هەرچەندە ئێوە ڕەشەبا بەرەڵا دەکەن و لێیان دەگەڕێن
لەدژی کلێسایان بجەنگن، هەر چەندە بەشەپۆلی سەربەکەف
کەشتییان دەشێوێنن، هەڵیان دەلووشن؛
هەرچەندە ئێوە گوڵەگەنم بە زەوییەوە دەنووسێنن ،
درەختان لە ڕەگەوە هەڵدەکەنن؛
قەڵایان بەسەر سەری پاسەوانەکانیاندا دەڕمێنن؛
سەری کۆشک و قووچەکەکان بەرەو بناغەکانیان دادەنەوێنن؛
گەنجینەی سروشت تێک دەشێوێنن؛
تا ڕادەی ئەوەی ڕووخان لەخۆی وەڕس بێت. چ بپرسم وەڵامم بدەنەوە.

**یەکەم جادووگەر:** قسە بکە

**دووەم جادووگەر:** داوا بکە.



And now about the cauldron sing,
Like elves and fairies in a ring,
Enchanting all that you put in.
*[Music and a song, "Black spirits," etc]*

**SECOND WITCH:**
By the pricking of my thumbs,
Something wicked this way comes:-- *[Knocking]*
Open, locks,
Whoever knocks!

*[Enter Macbeth.]*

**MACBETH:**
How now, you secret, black, and midnight hags!
What is't you do?

**ALL:**
A deed without a name.

**MACBETH:**
I conjure you, by that which you profess,
Howe'er you come to know it, answer me:
Though you untie the winds, and let them fight
Against the churches; though the yesty waves
Confound and swallow navigation up;
Though bladed corn be lodged, and trees blown down;
Though castles topple on their warders' heads;
Though palaces and pyramids do slope
Their heads to their foundations; though the treasure
Of nature's germins tumble all together,
Even till destruction sicken, answer me
To what I ask you.

**FIRST WITCH:**
Speak.

**SECOND WITCH:**
Demand.

**THIRD WITCH:**

We'll answer.

**FIRST WITCH:**

Say, if thou'dst rather hear it from our mouths,
Or from our masters?

**MACBETH:**

Call 'em, let me see 'em.

**FIRST WITCH:**

Pour in sow's blood, that hath eaten
Her nine farrow; grease that's sweaten
From the murderer's gibbet, throw
Into the flame.

**ALL:**

Come, high or low;
Thyself and office deftly show!
*[Thunder. First Apparition, an armed Head.]*

**MACBETH:**

Tell me, thou unknown power,--

**FIRST WITCH:**

He knows thy thought:
Hear his speech, but say thou nought.

**APPARITION:**

Macbeth! Macbeth! Macbeth! Beware Macduff;
Beware the Thane of Fife.--Dismiss me:--Enough.
*[Descends.]*

**MACBETH:**

Whate'er thou art, for thy good caution, thanks;
Thou hast harped my fear aright:--but one word more,--

**FIRST WITCH:**

He will not be commanded. Here's another,



**سێیەم جادووگەر:** وەڵامت دەدەینەوە.

**یەکەم جادووگەر:** پێمان بڵێ حەز دەکەیت لە دەمی ئێمە ببیستی،
یان لە هی گەورەکانمانەوە.

**ماکبێس:** بانگیان بکەن، دەمەوێ بیانبینم.

**یەکەم جادووگەر:** خوێنی ئەو مالۆسەی
کە نۆ کودەڵەی خواردووە، لەگەڵ ئەو بەزەی
کە لە ئارەقەی سەرپەتی سێدارەی مرۆڤکوژەوە گیراوە،
فڕێ بدە ناو گڕەکەوە.

**هەموویان:** لە بەرزان بێ یان نەوی
زوو بۆی بەدیار بکەوی.
(گرمە، تاپۆی یەکەم، هی سەرێکی زرێ دارە)

**ماکبێس:** ئەی هێزی نەزانراو، پێم بڵێ –

**یەکەم جادووگەر:** ئەو بیرەکانت باش دەزانێت
گوێی لێ بگرە ورتەت نەیەت.

**یەکەم تاپۆ:** ماکبێس! ماکبێس! ماکبێس! ئاگات لە (ماکدەف)بێ،
ئاگات لە سەرداری (فایف)بێ– بەسە، لێم بگەڕێ.
(دەچێتە خوار)

**ماکبێس:** تۆ هەرکێ بیت ، سوپاس بۆ وریاکردنەوەکەت:
تۆ بە ڕاستی ترسی منت زانی ، بەڵام قسەیەکی ترم:–

**یەکەم جادووگەر:** ئەو بەرفەرمان نابێت، ئەوە یەکێکی ترە

More potent than the first.

*[Thunder. Second Apparition, a bloody Child.]*

**APPARITION:**

Macbeth! Macbeth! Macbeth! -

**MACBETH:**

Had I three ears, I'd hear thee.

**APPARITION:**

Be bloody, bold, and resolute; laugh to scorn
The power of man, for none of woman born
Shall harm Macbeth.

*[Descends.]*

**MACBETH:**

Then live, Macduff: what need I fear of thee?
But yet I'll make assurance double sure,
And take a bond of fate: thou shalt not live;
That I may tell pale-hearted Fear it lies,
And sleep in spite of thunder.

*[Thunder. Third Apparition, a Child crowned, with a tree in his hand.]*

What is this,
That rises like the issue of a king,
And wears upon his baby brow the round
And top of sovereignty?

**ALL:**

Listen, but speak not to't.

**APPARITION:**

Be lion-mettled, proud; and take no care
Who chafes, who frets, or where conspirers are:
Macbeth shall never vanquished be, until
Great Birnam wood to high Dunsinane hill



که لەوەی یەکەم بەهێزترە.

(گرمەیە، تاپۆی دووەم، منداڵێکی خوێناوییە)

**دووەم تاپۆ:** ماکبێس! ماکبێس! ماکبێس!

**ماکبێس:** خۆزگە سێ گوێم هەبوایە تا بەهەرسێکان گوێم لێت بگرتایە.

**دووەم تاپۆ:** خوێنرێژ بە، ئازا و چاو نەترس.

گاڵتە بە هێزی مرۆڤ بکە. لەوەی لە ژنان بووە مەترسە
ئەوان ناتوانن ئازارت پێ بگەیەنن.

(دەچێتە خوار)

**ماکبێس:** بۆ خۆت بژی (ماکدەف):چ پێویستە لێت بترسم؟
بەڵام من ئەو دڵنیاییيە دووپات دەکەمەوە و
پەیمانێک لەگەڵ چارەنووسدا دەبەستم: تۆ نابێ بژیت؛
تا بتوانم بە ترسی دڵزەرد بڵێم درۆ دەکەیت و
سەرەڕای گرمە و مەترسی بتوانم بخەوم:–

(گرمەیە، تاپۆی سێیەم، منداڵێکی تاج لەسەرەو
درەختێکی لە دەستە).

ئەوە کێیە
کە وەک شازادان دەردەکەوێت و
تاجی خڕی سەروەری
لەسەر نێو چەوانی منداڵانەی داناوە؟

**هەموویان:** گوێ بگرە و قسەی لەگەڵ مەکە.

**سێیەم تاپۆ:** دڵ شێرانە و لە خۆبایی و بێ باک بە
بەرامبەر ئەوانەی بێزار و هیلاکت دەکەن یان پیلان دەنێنەوە؛
ماکبێس هەرگیزاو هەرگیز نابەزێت
تا دارستانی (بێرنام)ی مەزن لە دژیا

بەرەو گردە بەرزەکانی (دەنزینەن) نەیەت.

(دەچێتە خوار)

**ماکبێس:** هەرگیز ئەو شتە ناقەومێت:

کێ دەتوانێ لە دارستان رابخورێت؛

فەرمان بەدرەخت بکا ڕەگی پتەوی خۆی هەڵکێشێت؟ نوقڵانەی چاکە

یاخی مردوو هەرگیز نا ڕاسن لەو خاکە

تا دارستانی (بێرنام) نەجمێت، (ماکبێس)ی پایەبەرز

بە ئاسایی دەژیت بەبێ ترس و لەرز

تا دوا هەناسەی دەداتە دەست کات و مەرگی سروشتی مرۆڤ.–

هێشتا دڵم توند لێ دەدا بۆ زانینی تاقە شتێک، ئۆف:

پێم بڵێن (ئەگەر ئێوە ئەوەندە دەزانن). ئایا ڕۆژێ دێ نەوەکانی (بانکۆ)

لەو شانشینە فەرمانڕەوابن؟

**هەموویان:** داوای چی تر مەکە.

**ماکبێس:** دەمەوێ دڵنیابم: ئەوەم پێ نەڵێن

نەفرەتێکی هەتا هەتایەتان لێ بباریێت! دە بڵێن؟

ئەو قازانە بۆ ڕوو دەچێت؟ ئەو دەنگانە چ دەڵێن!

(دەنگی دووزەلە دێت)

**یەکەم جادووگەر:** دەرکەوە!

**دووەم جادووگەر:** دەرکەوە!

**سێیەم جادووگەر:** دەرکەوە!

**هەموویان:** وەرە بەرچاوی، دڵێ پڕ بکە لە خەم.

وەک سێبەر دەرکەوە، دوایی بڕۆ خاترجەم.

[هەشت شا دەردەکەون، دواینیان ئاوێنەیەکی



Shall come against him.

*[Descends.]*

**MACBETH:**

That will never be:
Who can impress the forest; bid the tree
Unfix his earth-bound root? Sweet bodements, good!
Rebellion's head, rise never till the wood
Of Birnam rise, and our high-placed Macbeth
Shall live the lease of nature, pay his breath
To time and mortal custom.--Yet my heart
Throbs to know one thing: tell me,(if your art
Can tell so much,) shall Banquo's issue ever
Reign in this kingdom?

**ALL:**

Seek to know no more.

**MACBETH:**

I will be satisfied: deny me this,
And an eternal curse fall on you! Let me know:--
Why sinks that cauldron? and what noise is this?

*[Hautboys.]*

**FIRST WITCH:**

Show!

**SECOND WITCH.**

Show!

**THIRD WITCH.**

Show!

**ALL.**

Show his eyes, and grieve his heart;
Come like shadows, so depart!
*[A show of eight kings the last with a*

له دەستە: تارمایی (بانکۆ)یان لەدوایە.]

**ماکبێس:** (بۆ یەکەم پاشای دیمەنەکە) تۆ زۆر بە ڕۆحی (بانکۆ)

دەچیت: دەک بڕووخێی!

تانجەکەت گلێنەی چاوانم دەتووزێنێتەوە (بۆ دووەم شا)

پرچی تۆ

نێو چەوانی زێڕتێگیراوی تۆش وەک هی یەکەمە:-

(بۆ جادووگەران) سێیەمیش وەک ئەوانیترە: پیرێژنە قۆڕی قڕێژنینە

بۆ ئەوەم پێ پیشان دەدەن؟- چوارەمیش؟- ئەی چاو ببینە!

چی! ئایا ئەو ریزە تا ڕۆژی قیامەت درێژ دەبێتەوە.

یەکێکی دیش؟- حەوتەمیش؟- چی دی نابینم:-

خۆ هەشتەمیش دەردەکەوێت کە ئاوێنەیەکی لە دەستە و

گەلێکی دیشم پێ نیشان دەدات؛ هەروا لەدەست هەندێکیان

دووگۆ و داردەستی سێ دەسکی دەبینم

چ دیمەنێکی ترسناکە!- ئێستا، دەبینم ئەوە ڕاستە،

چونکە (بانکۆ)ی پرچ خوێناوی پێم دەخەنێتەوە و

بۆ نەوەکانی خۆی پەنجەم بۆ درێژ دەکات:- چی! ئاخۆ وادەبێت؟

**یەکەم جادووگەر:** بەڵێ گەورەم، هەموو ئەمە وادەبێت:- بەڵام چییە

بۆچ ماکبێس وا نقوومی دەریای سەرسامییە؟

وەرن خوشکان، با دڵی خۆش بکەین

چاکترین شادی پێ نیشان بدەین.

من هەواکە دەفروسمێنم تاپڕ بێ لە دەنگ

کە سەمای سەیری بۆ دەکەن تا نەبێ دڵتەنگ،

بەڵکو ئەو شایە گەورەیە بڵێ بەخشندانە

ئەرکەکانمان بۆ بەخێرهێنانی وەکو شایانە.

(مۆسیقا، جادووگەرەکان سەما دەکەن و لەگەڵ هێکێت ون دەبن)



*glass in his hand; Banquo`s Ghost following.]*

**MACBETH:**

*[To the First king in the show]* Thou are too like the spirit of
Banquo; down! Thy crown does sear mine eyeballs:*[To the second king]*and
thy hair, Thou other gold-bound brow, is like the first,
*[To the Witches]* A third is like the former, filthy hags!
Why do you show me this? a fourth!--Start, eyes!
What, will the line stretch out to the crack of doom?
Another yet!--A seventh!--I'll see no more:--
And yet the eighth appears, who bears a glass
Which shows me many more; and some I see
That twofold balls and treble sceptres carry.
Horrible sight!--Now I see 'tis true;
For the blood-boltered Banquo smiles upon me,
And points at them for his.--What! is this so?

**FIRST WITCH:**

Ay, sir, all this is so:--but why
Stands Macbeth thus amazedly?
Come,sisters, cheer we up his sprites,
And show the best of our delights;
I'll charm the air to give a sound,
While you perform your antic round;
That this great king may kindly say,
Our duties did his welcome pay.
*[Music. The Witches dance, and then vanish with Hecate.]*

**MACBETH:**

Where are they? Gone?--Let this pernicious hour
Stand aye accursed in the calendar!--
Come in, without there!

*[Enter Lennox.]*

**LENNOX:**

What's your grace's will?

**MACBETH:**

Saw you the weird sisters?

**LENNOX:**

No, my lord.

**MACBETH:**

Came they not by you?

**LENNOX:**

No, indeed, my lord.

**MACBETH:**

Infected be the air whereon they ride;
And damn'd all those that trust them!--I did hear
The galloping of horse: who was't came by?

**LENNOX:**

'Tis two or three, my lord, that bring you word
Macduff is fled to England.

**MACBETH:**

Fled to England!

**LENNOX:**

Ay, my good lord.

**MACBETH:**

*[Aside]* Time, thou anticipat'st my dread exploits:
The flighty purpose never is o'ertook
Unless the deed go with it. From this moment



**ماکبێس:** لە کوێن؟ ڕۆیشتن؟- یاخوا ئەو کاتژمێرە نەفرەتییە،
هەتا هەتایە لە مێژوودا لێی بێ لەعنەتییە!
وەرە ژووریَ، کێ لە دەرەوەیە!

(لینۆکس دێتە ژوور)

**لینۆکس:** بەڕێزتان چ دەفەرموون؟

**ماکبێس:** خوشکانی چارەنووست بینی؟

**لینۆکس:** نەخێر، گەورەم.

**ماکبێس:** بەلای تۆ دانەهاتن؟

**لینۆکس:** ئەوەی ڕاستی بێ، نەخێر، گەورەم.

**ماکبێس:** دەک ئەو بایەی سواری دەبن پڕ لە دەرد بێت،
ئەوانەی پێشیان باوەڕ دەکەن بە نەفرەت بن!-
گوێم لە چوارناڵەی ئەسپان بوو، کێ بوو هات؟

**لینۆکس:** گەورەم دوو کەس هەواڵی هەڵاتنی
(ماکدەف)یان بۆ ئینگلتەرا هێناوە.

**ماکبێس:** هەڵاتووە بۆ ئینگلتەرا؟

**لینۆکس:** بەڵێ، سەروەری گەورەم.

**ماکبێس:** (لەلاوە) ئەی کات، تۆ بەپێش کارە ترسناکەکانم دەکەویت:
هەرگیز هیوای تیژفڕ نابەزێنرێت
مەگەر کردار قەرەبەقەرەی بڕوات. لەم ساتەوە بەدواوە

دەبێ هەرە یەکەم شتی ناو دڵم
بکەمە هەرە یەکەمی دەستم، تەنانەت هەر ئێستا
بۆ ئەوەی تانجی کردار بنێمە سەر بیرەکانم و
لەگەڵ بیرکردنەوەدا بکرێن: بەسەر قەڵای (ماکدەف) دادەدەم
ناوچەی (فایف) دەگرم؛ ژن و منداڵ و
هەموو ئەو گیانە بەدبەختانەی دەچنەوە سەر ئەو
دەدەمە بەردەمی شمشێر. با وەک گەوجان
چیدی خۆ هەڵنەکێشم؛ بڵێم وا دەکەم. بەرلەوەی هیوام ساردبێتەوە
بەڵام نامەوێ چیدی ئەو دیمەنانە ببینم! (بۆ لینۆکس) کوا ئەو جوامێرانە
دەی لە کوێن بمبە لایان.

(دەڕۆن)



The very firstlings of my heart shall be
The firstlings of my hand. And even now,
To crown my thoughts with acts, be it thought and done:
The castle of Macduff I will surprise;
Seize upon Fife; give to the edge o' the sword
His wife, his babes, and all unfortunate souls
That trace him in his line. No boasting like a fool;
This deed I'll do before this purpose cool:
But no more sights! *[To Lenox]* Where are these gentlemen?
Come, bring me where they are.

[Exeunt.]

# دیمەنی دووەم

## ناوچەی فایف

ژوورێک لە قەڵای ماکدەف.

خاتوو ماکدەف و کوڕەکەی و ڕۆز دێنە ژوور.

**خاتوو ماکدەف:** چی کردبوو تا لە وڵات رابکات؟

**ڕۆز:** خانم دەبێ تۆ ئارامیت هەبێت.

**خاتوو ماکدەف:** ئەو نەیبوو:

هەڵاتنەکەی شێتی بوو: کاتێک کردارەکانمان

نامانکەن بە خایەن، ترس وامان لێ دەکات.

**ڕۆز:** تۆ نازانیت

ئاخۆ ژیری بوو یان ترس بوو وای لێ کرد.

**خاتوو ماکدەف:** ژیری ! ژن و منداڵی خۆی بە جێ بێڵێت،

خان و مان و سامانی خۆی بەجێ بێڵێ و

هەڵێت؟ ئەو ئێمەی خۆش ناوێت:

ئەو هەستی سروشتی کەمە؛ چونکە فیسقەگوڵلەی بەسەزمان

کە بچووکترین باڵندەیە لە دژی کوندەبۆ

بۆ بەچکەی ساوای خۆی دەجەنگێت.

هەمووی ترسە، هیچی خۆشەویستی نییە؛

ژیریشی هەر بەقەد ئەوەیە، ئەو هەڵاتنەشی

دژی هەموو ژیرییەکە.

**ڕۆز:** ئامۆزای هەرە نازدارم،

تکام وایە دان بەخۆتا بگریت: بەڵام مێردت



## Scene II

**Fife**

*A Room in Macduff's Castle.*

*[Enter Lady Macduff, her Son, and Ross.]*

**LADY MACDUFF:**

What had he done, to make him fly the land?

**ROSSE:**

You must have patience, madam.

**LADY MACDUFF:**

He had none:
His flight was madness: when our actions do not,
Our fears do make us traitors.

**ROSSE:**

You know not
Whether it was his wisdom or his fear.

**LADY MACDUFF:**

Wisdom! to leave his wife, to leave his babes,
His mansion, and his titles, in a place
From whence himself does fly? He loves us not:
He wants the natural touch; for the poor wren,
The most diminutive of birds, will fight,
Her young ones in her nest, against the owl.
All is the fear, and nothing is the love;
As little is the wisdom, where the flight
So runs against all reason.

**ROSSE:**

My dearest coz,
I pray you, school yourself: but, for your husband,

پیاوێکی چاک و ژیر و خاوەن هەستە،
زۆر چاک لەگەڕو گێچەڵی ڕۆژگار دەگات. ناوێرم پتر بڵێم:
بەڵام زەمانە دڵڕەقە کاتێک ئێمە خایەنین و
بە خۆشمان نازانین؛ قسە و قسەلۆک
دەمانترسێنن، ناشزانین لە چی دەترسین
کەچی ئێمە سواری دەریایەکی سەرشێتی پڕ باهۆز بووین و
بۆ هەر لایەک بجوولێین –. خوا حافیزت لێ دەکەم:
زۆر دوورناکەومەوە و زوو دێمەوە ئێرە.
ئەگەر شتەکان بەو خراپییە بگەن یان دەوەستن یان بەرز دەبنەوە و
وەک جارانیان لێ دێتەوە.(بۆ کوڕی ماکدەف) ئامۆزای ژیکەلانەم
خوا چاوی لێت بێت!

**خاتوو ماکدەف:** باوکی هەبوو، وا ئێستا بێ باوکە.

**ڕۆز:** زۆر گەوجم گەر لەوە پتر بمێنمەوە،
چونکە ئەوە دەبێتە مایەی شەرمەزاری من و نارەحەتی تۆ:
هەر ئێستا دەڕۆم.

(دەڕوات)

**خاتوو ماکدەف:** (بۆ کوڕەکەی) کوڕە، باوکت مردووە
ئینجا چی دەکەیت؟ چۆن دەژیت؟

**کوڕەکە:** دایە، وەکو باڵندان.

**خاتوو ماکدەف:** چی ، بە کرم و مێش و مەگەز؟

**کوڕەکە:** مەبەستم وایە، هەرچی دەستم بکەوێت، ئەوانیش هەر وان.

**خاتوو ماکدەف:** باڵندەی بەسەزمان! ئەدی هەرگیز لە دواو و دمکانەو
تەپکە و فاق ناترسیت؟



He is noble, wise, Judicious, and best knows
The fits o' the season. I dare not speak much further:
But cruel are the times, when we are traitors,
And do not know ourselves; when we hold rumour
From what we fear, yet know not what we fear,
But float upon a wild and violent sea
Each way and move.--I take my leave of you:
Shall not be long but I'll be here again.
Things at the worst will cease, or else climb upward
To what they were before.*[To her Son]* My pretty cousin,
Blessing upon you!

**LADY MACDUFF:**
Fathered he is, and yet he's fatherless.

**ROSSE:**
I am so much a fool, should I stay longer,
It would be my disgrace and your discomfort:
I take my leave at once.

*[Exit.]*

**LADY MACDUFF:**
*[To her Son]* Sirrah, your father's dead;
And what will you do now? How will you live?

**SON:**
As birds do, mother.

**LADY MACDUFF:**
What, with worms and flies?

**SON:**
With what I get, I mean; and so do they.

**LADY MACDUFF:**
Poor bird! thou'dst never fear the net nor lime,
The pit-fall nor the gin.

**SON:**

Why should I, mother? Poor birds they are not set for.
My father is not dead, for all your saying.

**LADY MACDUFF:**

Yes, he is dead: how wilt thou do for father?

**SON:**

Nay, how will you do for a husband?

**LADY MACDUFF:**

Why, I can buy me twenty at any market.

**SON:**

Then you'll buy 'em to sell again.

**LADY MACDUFF:**

Thou speak'st with all thy wit; and yet, i' faith,
With wit enough for thee.

**SON:**

Was my father a traitor, mother?

**LADY MACDUFF:**

Ay, that he was.

**SON:**

What is a traitor?

**LADY MACDUFF:**

Why, one that swears and lies.

**SON:**

And be all traitors that do so?

**LADY MACDUFF:**

Everyone that does so is a traitor, and must be hanged.

**SON:**

And must they all be hanged that swear and lie?

**LADY MACDUFF:**

Every one.



**کوڕەکە:** دایە، بۆ بترسم؟

ئەوانە بۆ باڵندەی بچووک دانانرێنەوە.

تۆش بیڵێیت، باوکم نەمردووە.

**خاتوو ماکدەف:** بەڵێ ، مردووە، ئینجا چی دەکەیت بۆ باوکێک؟

**کوڕەکە:** نەخێر. ئینجا تۆ چی دەکەیت بۆ مێردێک؟

**خاتوو ماکدەف:** بۆچ، دەتوانم بیست مێرد لەهەر بازاڕێک بکڕم.

**کوڕەکە:** کەواتە دەیانکڕیت تا بیانفرۆشیتەوە.

**خاتوو ماکدەف:** بە هەموو زیرەکییەکەوە دەدوێیت:

بەڵام بەڕاستی ئێستا تۆ پێویستیت هەر بەوەندە زیرەکییە.

**کوڕەکە:** دایە، ئەرێ باوکم خایەن بوو؟

**خاتوو ماکدەف:** بەڵێ، وابوو.

**کوڕەکە:** دایە، خایەن چییە؟

**خاتوو ماکدەف:** ئەوەیە کە سوێند دەخوا و درۆ دەکات.

**کوڕەکە:** ئەرێ هەموو ئەوانەی وا دەکەن خایەنن؟

**خاتوو ماکدەف:** هەر کێ وابکات خایەنە و دەبێ لە سێدارە بدرێت.

**کوڕەکە:** ئایا هەر دەبێ هەموو کەسێک کە سوێند بخوا و درۆ بکا لە سێدارە بدرێت؟

**خاتوو ماکدەف:** هەر هەموویان.

**کوڕەکە:** کێ لە سێدارەیان دەدات؟

**خاتوو ماکدەف:** پیاوە شەرەفمەندەکان.

**کوڕەکە:** کەواتە سوێندخۆر و درۆزنەکان گەوجن، چونکە درۆزن و گەوج
ئەوەندە زۆرن دەتوانن لە شەرەفمەندەکان بدەن و لە سێدارەیان بدەن.

**خاتوو ماکدەف:** خوا ئاگادارت بێت، مەیموونی بەسەزمان! بەڵام تۆچی دەکەیت
بۆ باوکێک؟

**کوڕەکە:** ئەگەر باوکم مردبایە، بۆی دەگریایت؛ ئەگەر نەگریت ئەوە
نیشانەیەکی باشە کە من زوو بەزوو باوکێکی دیکەم دەبێت.

**خاتوو ماکدەف:** ئەی هەرزەگۆی بەسەزمان، ئەوەچی دەڵێیت!

(پەیامهێنێنک دێتە ژوور)

**پەیامهێن:** سڵاوت لێ بێت ئەی خانمی جوان! من لەلات نەناسراوم،
هەرچەندە پایەبەرزی تۆ لەلای من ئاشکرایە.
دەترسم بەم زووانە مەترسی لێت نزیکبێتەوە
ئەگەر ئامۆژگاری مرۆڤێکی خاکەڕا لە گوێ بگریت،
تۆ و بچووکەکانت لێرە مەمێنن،
وابزانم، زۆر دڕندەم تۆ بەم جۆرە بترسێنم،
بەڵام دڵڕەقییەکی نامرۆڤانەیە خراپەت لەگەڵ بکەم؛
ئەو خراپەیەی زۆر لێتەوە نزیکە. خوا ئاگای لێت بێت!
ناوێرم پتر بمێنمەوە.

(دەڕوات)

**خاتوو ماکدەف:** بۆ کوێ هەڵبێم؟
هیچ خراپییەکم نەکردووە. بەڵام وا بە بیرم دێتەوە



**SON:**

Who must hang them?

**LADY MACDUFF:**

Why, the honest men.

**SON:**

Then the liars and swearers are fools: for there are liars and swearers enow to beat the honest men and hang up them.

**LADY MACDUFF:**

Now, God help thee, poor monkey! But how wilt
thou do for a father?

**SON:**

If he were dead, you'ld weep for him: if you would not, it were a good sign that I should quickly have a new father.

**LADY MACDUFF:**

Poor prattler, how thou talk'st!

*[Enter a Messenger.]*

**MESSENGER:**

Bless you, fair dame! I am not to you known,
Though in your state of honor I am perfect.
I doubt some danger does approach you nearly:
If you will take a homely man's advice,
Be not found here; hence, with your little ones.
To fright you thus, methinks, I am too savage;
To do worse to you were fell cruelty,
Which is too nigh your person. Heaven preserve you!
I dare abide no longer.

*[Exit.]*

**LADY MACDUFF:**

Whither should I fly?
I have done no harm. But I remember now

لەسەر ئەو زەمینە دونیاییيەدا، گەر خراپە بکەیت
زۆرجار جێگای پەسنینی، هەندێ جار چاکە
بە گەوجییەکی مەترسیدار دەزانن، کەواتە مخابن.
بۆ چەکی بەرگری ژنانە بکەمە شان و
بڵێم هیچ خراپییەکم نەکردووە؟ ئەو دەموچاوانە کێن؟
(پیاوکوژەکان دێنە ژوور)

**پیاوکوژ:** مێردت لە کوێیە؟

**خاتوو ماکدەف:** هیوادارم لە جێگەیەکی ئەوەندە ناپیرۆز نەبێت
کە یەکێکی وەک تۆ پێی ببینرێتەوە.

**پیاوکوژ:** ئەو خاینە.

**کوڕەکە:** درۆ دەکەیت، هەی نامەردی بسک درێژ!

**پیاوکوژ:** چی، هەی بێ قیمەت. (شمشێری لێ دەدات)
هەی ناکەس بەچەی خیانەتکار!

**کوڕەکە:** دایە، کوشتمی:
تکایە، راکە. (دەمرێت)
[خاتوو ماکدەف هەڵدێتە دەرەوەو هاوار دەکات (کوشتیان!)
(پیاوکوژەکانیش بە دواوەیەوەن)]



I am in this earthly world; where to do harm
Is often laudable; to do good sometime
Accounted dangerous folly: why then, alas,
Do I put up that womanly defence,
To say I have done no harm?--What are these faces?

*[Enter Murderers.]*

**FIRST MURDERER:**
Where is your husband?

**LADY MACDUFF:**
I hope, in no place so unsanctified
Where such as thou mayst find him.

**FIRST MURDERER:**
He's a traitor.

**SON:**
Thou liest, thou shag-eared villain!

**FIRST MURDERER:**
What, you egg!

*[Stabbing him.]*

Young fry of treachery!

**SON:**
He has killed me, mother:
Run away, I pray you! *[Dies.]*
*[Exit Lady Macduff, crying "Murder",and pursued by the Murderers.]*

# دیمەنی سێیەم

## ئینگلتەرا . ژوورێک لە کۆشکی پاشادا

مالکۆڵم و ماکدەف دێنە ژوور

**مالکۆڵم:** با بچینە پەنایەکی چۆل و لەوێ

کوڵی دڵی خەمگینمان هەڵڕێژین.

**ماکدەف:** چاکتر وایە

بەتوندی شمشێری مەرگ هەڵگرین و وەک پیاوی چاک

بەشاقاوی مەزن بەرەو وڵاتی وێرانمان بکەوینە رێ، هەموو بەیانییەکی نوێ

بێوەژنی نوێ دەزیرێنن، هەتیوی نوێ دەگرین، خەمی نوێ بەرەو

ڕووی ئاسمان دەبێتەوە تا دەنگ دەداتەوە و

وەک بڵێی ئەویش لەگەڵ سکۆتلەندا هەست بەو ئازارە دەکات و

شین و زاری دەکات.

**مالکۆڵم:** ئەوەی بروام پێی هەبێت، خەمی لێ دەخۆم،

ئەوەی دەیزانم، باوەڕم پێی هەیەو ئەوەی پێم چاک دەکرێتەوە

هەر کاتێک بارێکی لەبار ڕەخسا چاکی دەکەمەوە

ئەوەی باست کرد ڕەنگە وابێت؛

ئەو زۆردارەی کە تەنیا ناوهێنانی زمانمان کول دەکات،

جاران بەپیاوێکی دڵسۆز دادەنراو تۆ زۆرت خۆشدەویست؛

هێشتاش دەستی لە تۆ نەوەشاندووە. من گەنجم، بەڵام

ڕەنگە تۆ بەهۆی منەوە شتێکت چنگ بکەوێت و

ژیری خۆتە کە بەرخێکی بەسەزمان و لاوازو هەژاری وەک من

بدەیتە دەست خوداوەندەکی تووڕە تا هێوری بکەیتەوە.



# Scene III

## England. A room in the King's Palace.

[Enter Malcolm and Macduff.]

**MALCOLM:**

Let us seek out some desolate shade and there
Weep our sad bosoms empty.

**MACDUFF:**

Let us rather
Hold fast the mortal sword, and, like good men,
Bestride our down-fall birthdom: each new morn
New widows howl; new orphans cry; new sorrows
Strike heaven on the face, that it resounds
As if it felt with Scotland, and yell'd out
Like syllable of dolour.

**MALCOLM:**

What I believe, I'll wail;
What know, believe; and what I can redress,
As I shall find the time to friend, I will.
What you have spoke, it may be so perchance.
This tyrant, whose sole name blisters our tongues,
Was once thought honest: you have loved him well;
He hath not touched you yet. I am young; but something
You may deserve of him through me; and wisdom
To offer up a weak, poor, innocent lamb
T ' appease an angry god.

**MACDUFF:**

I am not treacherous.

**MALCOLM:**

But Macbeth is.
A good and virtuous nature may recoil
In an imperial charge. But I shall crave your pardon;
That which you are, my thoughts cannot transpose;
Angels are bright still, though the brightest fell:
Though all things foul would wear the brows of grace,
Yet grace must still look so.

**MACDUFF:**

I have lost my hopes.

**MALCOLM:**

Perchance even there where I did find my doubts.
Why in that rawness left you wife and child,
(Those precious motives, those strong knots of love)
Without leave-taking?--I pray you,
Let not my jealousies be your dishonors,
But mine own safeties: you may be rightly just,
Whatever I shall think.

**MACDUFF:**

Bleed, bleed, poor country!
Great tyranny, lay thou thy basis sure,
For goodness dare not check thee! wear thou thy wrongs,
The title is affeered.--Fare thee well, lord:
I would not be the villain that thou thinkest
For the whole space that's in the tyrant's grasp
And the rich East to boot.

**MALCOLM:**

Be not offended:



**ماکدەف:** من خایەن نیم.

**مالکۆڵم:** بەڵام ماکبێس وایە.
ڕەنگە تەنانەت سروشتێکی باش و چاکمەند
بەفەرمانێکی شاهانە بابداتەوە. بەڵام من داوای لێبووردنت لێ دەکەم
لەوەی وات دەبینم و بیرەکانم ناتوانن تۆ بە چەشنێکی لە خۆت جیا ببینن.
فریشتەکان هێشتا ورشەدارن، گەرچی ورشەدارترینیان کەوتە خوارەوە.
هەرچەندە هەموو شتێکی گەن و بەد ڕوخساری چاکی دەپۆشێت
کەچی هێشتا چاکە دەبێ وەک خۆی دەربکەوێت.

**ماکدەف:** لێت نائومێد بووم.

**مالکۆڵم:** ڕەنگە من لەبەرئەوە گومانت لێ بکەم.
بۆچی بەو پەلەپەلییە ماڵ و منداڵی خۆت جێ هێشت
(ئەوانەی کە پاڵنەری هێژا و گرِی بەرزی خۆشەویستین)
بێ ئەوەی ماڵئاواییان لێ بکەیت؟- تکام وایە
گومانەکانم نەبنە هۆی بە ناپاک دانانی تۆ
بەڵام دەبنە هۆی سەلامەتی خۆم: ڕەنگە تۆ بەڕاستی ئەوەبیت
کە من بیرت لێ دەکەمەوە.

**ماکدەف:** ئەی وڵاتی هەژارم. دەبا هەر خوێنت لێ بتکێت!
تۆش ئەی زوڵمی مەزن، بناغەی خۆت بەدڵنیایی دابنێ،
چونکە چاکە ناوێرێت ڕێت پێ بگرێت! خراپەی خۆت بنوێنە
چونکە ناونیشانت بۆیان بۆتە شتێکی دڵنیا!- گەورەم، خوات لەگەڵ،
من نابم بەو نامەردەی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە
ئەگەر هەموو قەڵەمڕەوی ژێر دەستی خۆیم پێ ببەخشێت،
وێڕای سەرپاکی موڵکی دەوڵەمەندی ڕۆژهەڵات.

**مالکۆڵم:** بەقسەکانم دڵگیر مەبە:

من ناڵێم بە تەواوی ترسم لێتە.
وا بیر دەکەمەوە وڵاتەکەمان بە بن نیردا کەتووە،
دەگری و خوێنی لێ دێت و هەر ڕۆژەی برینێکی نوێ
دەچێتە پاڵ زامەکانی دی، وێڕای ئەوەش
هەست دەکەم دەستی خەڵک بۆ مافی من بەرز کراوەتەوە؛
لێرەش، لەلایەن شای چاکمەندی ئینگلتەرا
هەزاران پیاوی چاکم پێدراوە؛ بەڵام سەرەڕای ئەوەش
کاتێک پێ لەسەری زۆردارەکە دەنێم
یان بەسەری شمشێرەکەمی هەڵدەواسم، هێشتا وڵاتە هەژارەکەم
پتر خراپە لەوەی لەمەوپێش دەبینێ و
لە زۆر رووەوە پتر ئازار دەکێشێت
بە دەستی ئەو کەسەی دێتە سەر تەخت.

**ماکدەف:** ئەو کەسە کێ دەبێت؟

**مالکۆڵم:** مەبەستم لە خۆمە، کە دەزانم
من هەموو جۆرە خراپەیەکی تایبەتیم لێ موتوربە کراوە،
بێت و ئاشکرا بکرێن، (ماکبێس)ی ڕەش
وەک بەفری سپی بێ گەرد دەردەکەوێت؛ وڵاتە بەسەزمانەکەش
ئەو بە بەرخ دادەنێت کە لەگەڵ
خراپە بێ سنوورەکانی من بەراوردی دەکات.

**ماکدەف:** تەنانەت لە ناو ریزی
هەموو ئەوانەی لەناو دۆزەخی تۆقێنەردان شەیتانێکی
لەو نەفرەتیتر و خراپەکارتر نییە.

**مالکۆڵم:** من لەگەڵتام ئەو خوێنرێژە،
خراپپەرستە، تەماعکار و ساختەکار و خاپینۆک و
هەڵەشەو قین لە دڵ و سوچپەروەر و هەموو کەتنێکی لێ دەوەشێتەوە،



I speak not as in absolute fear of you.
I think our country sinks beneath the yoke;
It weeps, it bleeds; and each new day a gash
Is added to her wounds. I think, withal,
There would be hands uplifted in my right;
And here, from gracious England, have I offer
Of goodly thousands: but, for all this,
When I shall tread upon the tyrant's head,
Or wear it on my sword, yet my poor country
Shall have more vices than it had before;
More suffer, and more sundry ways than ever,
By him that shall succeed.

**MACDUFF:**
What should he be?

**MALCOLM:**
It is myself I mean: in whom I know
All the particulars of vice so grafted
That, when they shall be opened, black Macbeth
Will seem as pure as snow; and the poor state
Esteem him as a lamb, being compared
With my confineless harms.

**MACDUFF:**
Not in the legions
Of horrid hell can come a devil more damn'd
In evils to top Macbeth.

**MALCOLM:**
I grant him bloody,
Luxurious, avaricious, false, deceitful,
Sudden, malicious, smacking of every sin

جا هەر ناوێکی هەبێ؛ بەڵام شاوەتی من
بێ کۆتابییە، ژنەکانتان، کچەکانتان،
دایک و خانمەکانتان ناتوانن
جامی شەهوەتم پر بکەن؛ ئارەزووەکانم
بەسەر هەموو کۆسپێکدا سەردەکەوێت
کە بێتە ڕێگای ویستم: ماکبێس
باشترە لە یەکێکی وەک من فەرمانڕەوایی بکات.

**ماکدەف:** بەرزەفتنەکردنی بێ سنووری
ئارەزووە سروشتییەکانی مرۆڤ ستەمکارییە: هەر ئەوەشە
بۆتە هۆی لە دەستچوونی ناوەختی تەخت و تاجی
پاشایەتی. بەڵام مەترسە سەرەڕای ئەوەش
ئەمە ڕێگا لەو مافەت ناگرێت، تۆ دەتوانیت بەدزی
ئارەزووەکانت بە تەواوی تێر بکەیت و هێشتاش
خۆت وا دەربخەیت کە دەسبەردار نیت- دونیاش وا چاوبەست دەکەیت:
ئێمە گەلێ خانمی ئارەزوومەندمان هەن
ئامادەن ببنە نێچیری ئارەزووی راوکەرت و ئارەزووی تۆش
ئەوەندە چاوبرسی نییە، تا بە هەموو ئەوانەی
خۆت بۆ تەرخان دەکەن تێر نەبێت.

**مالکۆڵم:** وێڕای ئەوەش، لە سروشتی بەدمدا
تەماعێکی رسکاو و هەڵکشاوی وا لە ڕووانە
ئەگەر ببمە شا، مرۆڤە جوامێرەکان دەکوژم
تا دەست بەسەر زەوی و زاریان دابگرم؛
ئارەزووی خشڵەکانیان یان خانوو و ماڵی خەڵکی دی دەکەم:
هەبوونی پتر دەبێتە مەزەیەک
برسیترم دەکات تاوەکو بەخۆم



That has a name: but there's no bottom, none,
In my voluptuousness: your wives, your daughters,
Your matrons, and your maids, could not fill up
The cistern of my lust; and my desire
All continent impediments would o'erbear,
That did oppose my will: better Macbeth
Than such an one to reign.

**MACDUFF:**
Boundless intemperance
In nature is a tyranny; it hath been
The untimely emptying of the happy throne,
And fall of many kings. But fear not yet
To take upon you what is yours: you may
Convey your pleasures in a spacious plenty,
And yet seem cold, the time you may so hoodwink:
We have willing dames enough; there cannot be
That vulture in you, to devour so many
As will to greatness dedicate themselves,
Finding it so inclin'd.

**MALCOLM:**
With this, there grows,
In my most ill-composed affection, such
A staunchless avarice, that, were I king,
I should cut off the nobles for their lands;
Desire his jewels, and this other's house:
And my more-having would be as a sauce
To make me hunger more; that I should forge

Quarrels unjust against the good and loyal,
Destroying them for wealth.

**MACDUFF:**

This avarice
Sticks deeper; grows with more pernicious root
Than summer-seeming lust; and it hath been
The sword of our slain kings: yet do not fear;
Scotland hath foisons to fill up your will,
Of your mere own. All these are portable,
With other graces weighed.

**MALCOLM:**

But I have none: the king-becoming graces,
As justice, verity, temperance, stableness,
Bounty, perseverance, mercy, lowliness,
Devotion, patience, courage, fortitude,
I have no relish of them; but abound
In the division of each several crime,
Acting it many ways. Nay, had I power, I should
Pour the sweet milk of concord into hell,
Uproar the universal peace, confound
All unity on earth.

**MACDUFF:**

O Scotland! Scotland!

**MALCOLM:**

If such a one be fit to govern, speak:
I am as I have spoken.

**MACDUFF:**

Fit to govern!
No, not to live!--O nation miserable,
With an untitled tyrant bloody-sceptered,



شەڕی ناڕەوای وا لە دژی باش و دڵسۆزان بنێمەوە و
لەبەر سامانەکانیان لە ناویان ببەم.

**ماکدەف:** ئەم تەماعە
پتر رەگاژۆیە و ڕەگێکی خراپتر و قووڵتر
لە شاوەتی هاوینەت دادەکوتێت: هەر ئەوەش
شمشێری سەرگەردنی شایە کوژراوەکانمان بووە: بەڵام هێشتا مەترسە
کاتێک سکۆتلەندا دەبێتە هی خۆت ئەوەندەی سامان تێدایە
ئارەزووت تێر بکات، ئەو هەموو شتانە بەرگەیان دەگیرێت
ئەگەر لەگەڵ چاکەکانی ترت بەراورد بکرێن.

**مالکۆڵم:** بەڵام من هیچم نییە، لەو چاکییانەی شایستەی شایانن،
وەک دادپەروەری، ڕاستگۆیی، لەسەرخۆیی، خۆنەگۆڕی،
بەخشندەیی، خەڵک و وڵاتپارێزی، بەزەیی، بێ فیزی
خواپەرستی، بە ئارامی، ئازایەتی، خۆڕاگری،
هیچ لەوانە لە من بەدی ناکرێن؛ بەڵام
پسپۆرم لە دابەشکردنی هەر خراپەیەک بۆ چەندین تاوان و
جێبەجێ کردنیان جیابەجیا. نەخێر، هێزم هەبوایە،
جامی شیری تەباییم دەڕژاندە ناو دۆزەخ،
ئاشتی جیهانیم دەشێواند و
یەکێتی ئەو زەمینەم تێکوپێک دەدا.

**ماکدەف:** ئاە سکۆتلەندا! سکۆتلەندا!

**مالکۆڵم:** ئەگەر یەکێکی وا شایستەی فەرمانڕەواییە، بدوێ:
من چۆنم پێ گوتیت وام.

**ماکدەف:** شایستەی فەرمانڕەوایی؟
نەخێر، شایستەی ژیانیش نییە.- ئەی نەتەوەی کلۆڵ!
کەی جارێکی دی لە بندەستی زاڵمێکی زەوتکاری

داردەست خوێناوی ڕۆژانی خۆشی دەبینێتەوە،
لە کاتێکدا کە میراتگری ڕاستەقینەی تەختی شایەتیت
بەوەی خۆ لە گەڕانەوە بە دوور دەگرێت تاوانبارەو
نەفرەت لە بنەماڵە و بنەچەکەی خۆی دەکات؟ شای باوکت
شایەکی هەرە پیرۆز بوو: شاژنی دایکت کە تۆی لێ بوو،
پتر لەسەر چۆکان بوو بۆ نوێژ و خواپەرستی لەوەی بە پێوە بێت،
هەموو ڕۆژانی ژیانی ئارەزووەکانی خۆی دەمراند. خوات لەگەڵ!
ئەو خراپانەی لەسەر خۆتت ریزکردن
هەر ئەوانەن منیان لە سکۆتلەندا دەرپەڕاند:-- ئاە،ئەی دڵم،
هیواکانت لێرە بە کۆتا دێن.
**مالکۆڵم:** ماکدەف، ئەو سۆزە جوامێرانەت
کە زادەی دڵسۆزییە، لە ڕۆحمدا
هەمووی گومانێکی ڕەشی سڕییەوەو بیرەکانمی هێناوە جێ
بۆ ڕاستی و شەرەفمەندی و چاکی تۆ .(ماکبێس)ی شەیتانی
بەو فێڵانە لەوە دەگەڕا من ژێرچەنگ بخات،
بەڵام ژیرێتی خاکەڕاییم رام دەکێشێتەوە
لەوەی بەپەلە پێیان باوەڕ بکەم: بەڵام دەبا خوای سەر سەران
چاوی لەو پەیوەندییەی نێوانمان بێت! تەنانەت ئێستا
خۆم دەخەمە ژێر رانمایی تۆ و هەموو ئەو قسانەی لە دژی
خۆمم هەڵبەستابوون لە خراپە و تاوانکاری
بە سروشت و گیانم نامۆن. من هێشتا
ئافرەت چییە نایناسم؛ هەرگیز بەدرۆ سوێندم نەخواردووە؛
بەدەگمەن حەزم لە شتی خەڵکی بووە؛
هەرگیز بەڵێنی خۆمم نەشکاندووە: ئامادەش نیم
خیانەت لە شەیتان بکەم بۆ هاوەڵەکەی؛ بەڵام



When shalt thou see thy wholesome days again,
Since that the truest issue of thy throne
By his own interdiction stands accursed
And does blaspheme his breed? Thy royal father
Was a most sainted king; the queen that bore thee,
Oft 'ner upon her knees than on her feet,
Died every day she lived. Fare-thee-well!
These evils thou repeat'st upon thyself
Have banish'd me from Scotland. O my breast,
Thy hope ends here!

**MALCOLM:**

Macduff, this noble passion,
Child of integrity, hath from my soul
Wiped the black scruples, reconciled my thoughts
To thy good truth and honour. Devilish Macbeth
By many of these trains hath sought to win me
Into his power; and modest wisdom plucks me
From over-credulous haste: but God above
Deal between thee and me! for even now
I put myself to thy direction, and
Unspeak mine own detraction; here abjure
The taints and blames I laid upon myself,
For strangers to my nature. I am yet
Unknown to woman; never was forsworn;
Scarcely have coveted what was mine own;
At no time broke my faith; would not betray
The devil to his fellow; and delight

خۆشەویستیم بۆ ڕاستی بەقەد ژیانە:
یەکەم درۆم ئەوەبوو لەسەر خۆمم کرد.
ئەوەی بە ڕاستی منم هی تۆیە و دەیخەمە ژێر
خزمەتی تۆ و وڵاتەکەم بۆ فەرمان پێکردن:
ئەوەی ڕاستی بێ، پێش هاتنی تۆ بۆ ئێرە،
پیرە سیوارد، بە خۆ و بە دە هەزار شەڕکەرەوە،
خۆی ئامادە کردبووو خەریک بوو بەرەو ئەوێ بکەوێتە ڕێ.
ئێستا هەموو پێکەوە دەڕۆین و خوا بکات وەک چۆن
جەنگمان ڕەوایە بەختیش یارمان بێت، بۆ وا ماتی؟

**ماکدەف:** زۆر زەحمەتە شتی وا خۆش و ناخۆش
بەیەکجار پێکەوە هەڵکەون.

(نۆشدەرێک دێتە ژوور)

**مالکۆڵم:** باشە، هەر ئێستا پتر لەوە دەدوێین
(بۆ نۆشدەرەکە) تکایە، ئەرێ شا دێتە ئێرە؟

**نۆشدەر:** بەڵێ، گەورەم کۆمەڵێک مرۆڤی بەلەنگاز
چاوەڕێن چارەیان بکات: نەخۆشییەکانیان
بە مەزنترین هەوڵی نۆشدەران چارەسەر نەکراوە؛ بەڵام
بەو بەهرە پیرۆزەی ئاسمان پێی بەخشیوە
لەبەر دەستی ئەو چاک دەبنەوە.

**مالکۆڵم:** سوپاست دەکەم، نۆشدەر.

(نۆشدەرەکە دەڕوات)

**ماکدەف:** مەبەستی چ نەخۆشییەکە؟

**مالکۆڵم:** ناوی بەدشاییە:
ئەو شایە چاکە، چارەیەکی سەرسوڕمێنی ئەو دەردە دەکات.
لەوەتەی لێرە لە ئینگلتەرا ماوەتەوە



No less in truth than life: my first false speaking
Was this upon myself. What I am truly,
Is thine and my poor country's to command:
Whither, indeed, before thy here-approach,
Old Siward, with ten thousand warlike men
Already at a point, was setting forth:
Now we'll together; and the chance of goodness
Be like our warranted quarrel! Why are you silent?

**MACDUFF:**

Such welcome and unwelcome things at once
'Tis hard to reconcile.

*[Enter a Doctor.]*

**MALCOLM:**

Well; more anon.--
*[To the Doctor]* Comes the king forth, I pray you?

**DOCTOR:**

Ay, sir: there are a crew of wretched souls
That stay his cure: their malady convinces
The great assay of art; but, at his touch,
Such sanctity hath heaven given his hand,
They presently amend.

**MALCOLM:**

I thank you, doctor.

*[Exit Doctor.]*

**MACDUFF:**

What's the disease he means?

**MALCOLM:**

'Tis called the evil:
A most miraculous work in this good king;
Which often, since my here-remain in England,

زۆر جار بینیومە وا بکات. ئەو تەنیا بەخۆی
چاک دەزانێت چۆن ئەو بەهرەیە لە ئاسمان وەدەست دێنێت؛
بەڵام نەخۆشی وا سەیر کە نۆشدەران لێیان نائومێدن
لەبەر ئاوسان و کولک و برینی جەرگتەزێن،
بە نوێژ و نزا ئەو چاکیان دەکاتەوە؛
دراوێکی زێڕ دەخاتە ملیان: دەڵێن
ئەو بەهرەیەشی بۆ ئەوانەی لێی وەپاش دەکەون
جێ دێڵێت. وێڕای ئەو لایەنە چاکە سەیرەی
ئەو بەهرەیەکی خوایی هەیە بۆ پێشبینیکردن؛
گەلێ فەڕ و چاکەی دیش لە دەوری تەختی شاهانەیەتی
کە بەڵگەی چاکی هێزی ڕۆحیەتی.

(ڕۆز دێتە ژوور)

**ماکدەف:** بڕوانە، کێ دێت؟

**مالکۆڵم:** هاوڵاتی منە، بەڵام ناشی ناسم.

**ماکدەف:** بەخێر بێیت، ئامۆزای هەمیشە جوامێرم.

**مالکۆڵم:** ئێستا ناسیم، خودای گەورە ئەو کەسەی ئێمەی
لێکتر کردۆتە بێگانە لەناو ببات.

**ڕۆز:** ئامین، گەورەم.

**ماکدەف:** سکۆتلەندا وەک جاران ماوە؟

**ڕۆز:** مخابن، بۆ وڵاتە هەژارەکەم!
ئەوەندە ترساوە وەختە خۆی نەناسێتەوە.
ناتوانین بڵێین دایکمانە، بەڵکو گۆڕمانە،
کەس بزەیەکی لێ نابینرێت جگە لەوانەی هیچ نەزانن؛



I have seen him do. How he solicits heaven,
Himself best knows: but strangely-visited people,
All swoln and ulcerous, pitiful to the eye,
The mere despair of surgery, he cures;
Hanging a golden stamp about their necks,
Put on with holy prayers: and 'tis spoken,
To the succeeding royalty he leaves
The healing benediction. With this strange virtue,
He hath a heavenly gift of prophecy;
And sundry blessings hang about his throne,
That speak him full of grace.

*[Enter Rosse.]*

**MACDUFF:**
See, who comes here?

**MALCOLM:**
My countryman; but yet I know him not.

**MACDUFF:**
My ever-gentle cousin, welcome hither.

**MALCOLM:**
I know him now. Good God, betimes remove
The means that makes us strangers!

**ROSSE:**
Sir, amen.

**MACDUFF:**
Stands Scotland where it did?

**ROSSE:**
Alas, poor country!
Almost afraid to know itself. It cannot
Be called our mother, but our grave: where nothing,
But who knows nothing, is once seen to smile;

هەواکەی بە ئاخ و ناڵە و قیژە شەق کراوە
کەسیش ئاگای لێ نییە؛ کەسەری گەورە
بە شتێکی ئاسایی دادەنرێت؛ کەم وایە یەکێک
بپرسێ ئەو زەنگەی مەرگ بۆ کێیە. ژیانی مرۆڤە چاکەکان
بەر لەوەی گوڵی بەرکڵاویان[١٦] بژاکێ بەسەر دەچێت؛
دەمرن تەنانەت پێش ئەوەی نەخۆش بکەون.

**ماکدەف:** ئاهـ، چ چیرۆکێکی
پڕ بەسەرهات و ڕاستییە!

**مالکۆڵم:** دوا خەم چییە؟

**ڕۆز:** ئەو خەمەیە سەعاتێک پێشتر ڕووی داوە و لە دەمی گێڕەرەوەکەی دەدرێتەوە
بەوەی کۆنە، هەر خولەکەی یەکێکی نوێ ڕوودەدات.

**ماکدەف:** ژنەکەم چۆنە؟

**ڕۆز:** بۆچ، باشە.

**ماکدەف:** ئەدی هەموو منداڵەکانم؟

**ڕۆز:** ئەوانیش باشن.

**ماکدەف:** کابرای زۆردار ئاشتی و ئاسوودەیی لێ تێک نەداون؟

**ڕۆز:** نەخێر، ئەوان لە ئاسوودەییدا دەژیان کە جێم هێشتن.

**ماکدەف:** لە قسەکانت کەمدوو مەبە. چۆنن چۆن؟

**ڕۆز:** کاتێک بەدڵگرانییەوە دەهاتمە ئێرە

(١٦) بەپێی دەستووری سکوتلەندی ئەوان گوڵێکی جیاییان لە شەپقە دەدا.



Where sighs, and groans, and shrieks, that rent the air,
Are made, not marked; where violent sorrow seems
A modern ecstasy; the dead man's knell
Is there scarce asked for who; and good men's lives
Expire before the flowers in their caps,
Dying or ere they sicken.

**MACDUFF:**
O, relation
Too nice, and yet too true!

**MALCOLM:**
What's the newest grief?

**ROSSE:**
That of an hour's age doth hiss the speaker;
Each minute teems a new one.

**MACDUFF:**
How does my wife?

**ROSSE:**
Why, well.

**MACDUFF:**
And all my children?

**ROSS:**
Well too.

**MACDUFF:**
The tyrant has not battered at their peace?

**ROSSE:**
No; they were well at peace when I did leave 'em.

**MACDUFF:**
Be not a niggard of your speech: how goes't?

**ROSSE:**
When I came hither to transport the tidings,

بۆ هەواڵ هێنان، قاوێک بڵاو بۆوە
لە بارەی یاخیبوونی چەند هاوڕێیەکی هێژا؛
بە بڕوای من بەڵگەی ئەوەم هەبوو بە ڕاستیان بزانم
چونکە هێزی زۆردار خۆی ئامادە کردبوو و لەسەر پێ بوو.
ئێستا کاتی یارمەتیدانە، چاوتان لە سکۆتلەندا
سەربازتان بۆ دروست دەکات و وا لە ژنان دەکات بجەنگن
بۆ تووڕدانی خەمی جەرگبڕیان.

**مالکۆڵم:** با ئەوە مایەی خۆشییان بێت.
ئێمە بەڕێوەین. شای ئینگلتەرای چاک پەروەر
(سیوارد)ی ئازا و دە هەزار شەڕکەری پێ داوین؛
پیاوێکی وایە کە مەسیحیەت
لەو باشتر و شارەزاتری بەخۆوە نەدیوە.

**ڕۆز:** خۆزیا منیش بمتوانیبایە
وەڵامی ئەو خۆشییە بە شتێکی خۆش بدەمەوە! بەڵام من
قسەی وام پێیە دەبێ لە چۆڵەوانی بلوورێنرێت
نەوەکا گوێ بیان بیسێت.

**ماکدەف:** لە بارەی کێن؟
مەسەلەی گشتی؟ یان تەنها پەیوەندییان
بە تاقە سینەیەکە هەیە؟

**ڕۆز:** هیچ مێشکێکی بەڕۆمەت
ناتوانێت بەشێکی لەو مەینەتەدا نەبێت،
هەر چەندەش بەشی سەرەکی پەیوەندی بە تۆوەیە.

**ماکدەف:** ئەگەر وایە
لێم مەشارەوە، زوو بمدەرێ.

**ڕۆز:** با گوێچکەکانتان هەتا هەتایە نەفرەت لە زمانم نەکەن



Which I have heavily borne, there ran a rumour
Of many worthy fellows that were out;
Which was, to my belief, witnessed the rather,
For that I saw the tyrant's power a-foot:
Now is the time of help. Your eye in Scotland
Would create soldiers, make our women fight,
To doff their dire distresses.

**MALCOLM:**

Be't their comfort
We are coming thither: gracious England hath
Lent us good Siward and ten thousand men;
An older and a better soldier none
That Christendom gives out.

**ROSSE:**

Would I could answer
This comfort with the like! But I have words
That would be howled out in the desert air,
Where hearing should not latch them.

**MACDUFF:**

What concern they?
The general cause? or is it a fee-grief
Due to some single breast?

**ROSSE:**

No mind that's honest
But in it shares some woe; though the main part
Pertains to you alone.

**MACDUFF:**

If it be mine,
Keep it not from me, quickly let me have it.

**ROSSE:**

Let not your ears despise my tongue for ever,

که قورسترین دەنگیان بەسەردا دەبارێنێت،

چونکە لەوەتی هەن شتی وایان نەبیستووە.

**ماکدەف:** همف! دەیزانم.

**رۆز:** بەسەر قەلاتەکەتدا دراوە، ژن و منداڵەکانت

زۆر دڕندانە کوژراون: ئەگەر وەک خۆی

بگێڕمەوە چۆن ئەو کارمامزە نازدارانە کوژران

دەبێ مەرگی تۆش بخەمە پاڵیان.

**مالکۆڵم:** ئەی ئاسمانی پڕ بەزەیی:–

چی، پیاو! هەرگیز کڵاوەکەت مەخزێنە سەرچاوان:

خەمت بەقسە دەربڕە، ئەو خەفەتەی دەرنابڕدرێت

دەچرپێنێتە ناو گوێی دڵ و داوای لێ دەکات بڕووخێت.

**ماکدەف:** منداڵەکانیشم؟

**رۆز:** ژن و منداڵ و نۆکەر و

هەموو ئەوانەی لەوێ بوون.

**ماکدەف:** ئاخۆ دەبوایە من لەوێ نەبووام!

ژنەکەشم کوژرا!

**رۆز:** گوتم.

**مالکۆڵم:** دڵخۆش بە:

با تۆڵەی مەزن بکەینە دەرمانی دەردەکانمان

بۆ چاکردنی ئەو مەینەتییە مرۆڤکوژە.

**ماکدەف:** ئەو منداڵی نییە،– هەموو ژیکەلەکانم؟



Which shall possess them with the heaviest sound

That ever yet they heard.

**MACDUFF:**

Humh! I guess at it.

**ROSSE:**

Your castle is surprised; your wife and babes

Savagely slaughtered: to relate the manner

Were, on the quarry of these murdered deer,

To add the death of you.

**MALCOLM:**

Merciful heaven!--

What, man! ne'er pull your hat upon your brows;

Give sorrow words: the grief that does not speak

Whispers the o'er-fraught heart, and bids it break.

**MACDUFF:**

My children too?

**ROSSE:**

Wife, children, servants, all

That could be found.

**MACDUFF:**

And I must be from thence!

My wife killed too?

**ROSSE:**

I have said.

**MALCOLM:**

Be comforted:

Let's make us medicines of our great revenge,

To cure this deadly grief.

**MACDUFF:**

He has no children.--All my pretty ones?

گوتت هەموویان؟– ئاهـ ، ئەی کۆلارەی دۆزەخ!– هەموویان؟
چی ، هەموو منداڵەکانم و دایکیان
بەیەک چنگ لێ گیرکردن؟
**مالکۆڵم**: وەک پیاو بیبڕێنەوە.
**ماکدەف**: وا دەکەم،
بەڵام دەبێ وەک پیاویش هەستی پێ بکەم:
ناتوانم ئەوانە لە بیرخۆم ببەمەوە
کە لە لام هەرە نازدار بوون.– ئاسمان تەماشای دەکرد و
دەوری خۆی نەدیت؟ ماکدەفی تاوانبار!
هەموویان لەسەر تۆ کوژران، ئەوان کوژران
لەسەر خراپی خۆیان نا، بەڵام لەسەر من.
منیش هیچ نیم، خودایە دە لێیان خۆش بە!
**مالکۆڵم**: با ئەوە ببێتە هەسانی شمشێرت: با خەمت
ببێتە رق؛ دڵت کۆڵ مەکە، بوغزاوی بکە.
**ماکدەف**: ئۆهـ! دەتوانم بە چاوان وەک ژن بگریم و
بە زمان خۆ هەڵکێشم:– بەڵام ئەی ئاسمانی[17] دڵنەرم
نێوانمان هیچ مەهێڵە، ئەو شەیتانەی سکۆتلەندا و
من رووبەڕوو راگرە؛
لەبەردەم شمشێری من دایبنێ، ئەگەر هەڵات
خوا لەویش خۆش بێت!
**مالکۆڵم**: کاتەکە پیاوانە دەڕوات
وەرە با بچینە لای شا: هێزمان ئامادەیە،
لە هیچمان کەم نییە ڕۆیشتن نەبێ. (ماکبێس)

---

(١٧) لە سەردەمی شێکسپیردا نەدەبوایە ناوی خواو مەسیح و خاوەن شکۆ بە خراپی بهێنرێت. یاسایەکە بۆ ئەمە هەبوو، هەر کەسەی وای بکردابا دەبوایە (١٠) جونەیهە تاوانە بدات، بۆیە وشەی (خوا) کراوە بە (ئاسمان).



Did you say all?--O hell-kite!--All?
What, all my pretty chickens and their dam
At one fell swoop?

**MALCOLM:**

Dispute it like a man.

**MACDUFF:**

I shall do so;
But I must also feel it as a man:
I cannot but remember such things were,
That were most precious to me.--Did heaven look on,
And would not take their part? Sinful Macduff!
They were all struck for thee. Naught that I am,
Not for their own demerits, but for mine,
Fell slaughter on their souls: heaven rest them now!

**MALCOLM:**

Be this the whetstone of your sword. Let grief
Convert to anger; blunt not the heart, enrage it.

**MACDUFF:**

O, I could play the woman with mine eyes,
And braggart with my tongue!--But, gentle heavens,
Cut short all intermission; front to front
Bring thou this fiend of Scotland and myself;
Within my sword's length set him; if he 'scape,
Heaven forgive him too!

**MALCOLM:**

This time goes manly.
Come, go we to the king; our power is ready;
Our lack is nothing but our leave. Macbeth

Is ripe for shaking, and the powers above
Put on their instruments. Receive what cheer you may;
The night is long that never finds the day.
[Exeunt.]



بەرێکی گەییووە بۆ ڕاشەقاندن، هێزەکانی سەر سەرمانیش(*)
چەکی خۆیان کردۆتە شان. چەند دەتوانی خۆشی بچێژە
ئەو شەوەی هەرگیز ڕۆژی بە دوادانایە چ شەوێکی درێژە.
(دەڕۆن)

(*) واتە هێزە خواییەکان.

# دیمەنی یەکەم

## دەنزینەن. ژوورێکی ناوقەڵا

نۆشدەرێک و یاوەرژنێکی گەورە دێنە ژوور.

**نۆشدەر:** دوو شەو لەگەڵت ئێشکم گرت، هیچ ڕاستییەکم لە قسەکانت
نەدیت، کەی دواجار لە خەودا ڕۆیی؟

**یاوەرژن:** لەوەتی خاوەن شکۆ چۆتە مەیدانی جەنگەوە، لەجێگا ڕادەبێ و
جلی شەو دەکاتە بەر[18] و کانتۆر دەکاتەوە و کاغەز دەردێنێ و
قەدی دەکات و دەیخوێنێتەوەو مۆری دەکات و دەگەڕێتەوە ناو
جێگا لە کاتێکدا ئەم کارانە دەکات لە شیرین خەودایە.

**نۆشدەر:** سەر لێشێواوییەکی گەورەیە لە سروشتدا کە مرۆڤ خەوتووبێ و
کاری بێداریش رابپەڕێنێت! لەو بارە شێواوەی خەوتن دا،
جگە لە خەوڕۆیی و کارکردنی دی، ئایا ئەو کاتانە گوێت
لێ بوو چی لەبەر خۆی دەگوت؟

**یاوەرژن:** گەورەم من قسە لە دوای ئەو ناگێڕمەوە.

**نۆشدەر:** دەتوانیت بە منی بڵێیت چونکە پێویستە من بیانزانم.

**یاوەرژن:** بۆتۆ و بۆ هیچ کەس نا، چونکە هیچ بەڵگەیەکم نییە ڕاستی قسەکانمی پێ
بسەلمێنم. (خاتوو ماکبێس مۆمێکی پێیەو دێتە ژوور) بڕوانە! وا دێتە ئێرە.
ئەوە دەق شێوازی خۆیەتی، بەگیانی خۆم، لە شیرین خەودایە. لێی بڕوانە لە
پەنا بوەستە.

**نۆشدەر:** ئەو ڕۆناکییەی لە کوێ هێناوە؟

---

(١٨) لەم شانۆییەدا، لە زۆر جێگادا نیشانە بەوە دراوە کە ماکبێس و خاتوو ماکبێس بە ڕووتی
لەناو نوێن دەنوون.



# Scene I

## Dunsinane. A Room in the Castle

*[Enter a Doctor of Physic and a Waiting-Gentlewoman.]*

**DOCTOR:**

I have two nights watched with you, but can perceive no
truth in your report. When was it she last walked?

**GENTLEWOMAN:**

Since his majesty went into the field, I have seen her rise from
her bed, throw her nightgown upon her, unlock her closet,
take forth paper, fold it, write upon it, read it, afterwards seal it,
and again return to bed; yet all this while in a most fast sleep.

**DOCTOR:**

A great perturbation in nature,--to receive at once the benefit of sleep, and do the effects of watching! In this slumbery agitation, besides her walking and other actual performances, what, at any time, have you heard her say?

**GENTLEWOMAN:**

That, sir, which I will not report after her.

**DOCTOR:**

You may to me; and 'tis most meet you should.

**GENTLEWOMAN:**

Neither to you nor any one; having no witness to confirm my speech.

*[Enter Lady Macbeth, with a taper.]*

Lo you, here she comes!This is her very guise; and, upon my life, fast
asleep. Observe her; stand close.

**DOCTOR:**

How came she by that light?

**GENTLEWOMAN:**

Why, it stood by her: she has light by her continually; 'tis her command.

**DOCTOR:**

You see, her eyes are open.

**GENTLEWOMAN:**

Ay, but their sense is shut.

**DOCTOR:**

What is it she does now? Look how she rubs her hands.

**GENTLEWOMAN:**

It is an accustomed action with her, to seem thus washing her hands: I have known her continue in this a quarter of an hour.

**LADY MACBETH:**

Yet here's a spot.

**DOCTOR:**

Hark! she speaks. I will set down what comes from her, to satisfy my remembrance the more strongly.

**LADY MACBETH:**

Out, damned spot! out, I say!-- One; two; why, then 'tis time to do't ;-- Hell is murky!--Fie, my lord, fie! a soldier, and afeard? What need we fear who knows it, when none can call our power to account?--Yet who would have thought the old man to have had so much blood in him?

**DOCTOR:**

Do you mark that?

**LADY MACBETH:**

The Thane of Fife had a wife; where is she now?--What, will these hands ne'er be clean? No more o' that, my lord, no more o' that: you mar all with this starting.

**DOCTOR:**

Go to, go to; you have known what you should not.



**یاوەرژن:** لە تەنیشتییەوە بوو. فەرمانی کردووە کە بەردەوام  چرای لەلا بێت.

**نۆشدەر:** دەبینی، چاوەکانی کراوەن.

**یاوەرژن:** بەڵێ، بەڵام هەستەکانی داخراون.

**نۆشدەر:** ئەوە ئێستا چی دەکات؟ بڕوانە چۆن دەستەکانی لێک دەخشێنێت.

**یاوەرژن:** ئەوە لای ئەو کارێکی ئاساییە، واپێ دەچێت دەستەکانی بشوات، بینیومە جار وایە چارەکە سەعاتێک وادەکات.

**خاتوو ماکبێس:** هێشتا پشکێک بێرەوەیە.

**نۆشدەر:** گوێ بگرە! دەدوێت. ئەوەی دەیڵێت دەینووسمەوە، تا دڵنیاتر بم لەوەی بێتەوە بیرم.

**خاتوو ماکبێس:** لاچۆ ، پشکی نەعلەتی! دەڵێم، لاچۆ! سەعات بووە یەک، دوو! بۆچ، ئێستا کاتی بەجێگەیاندنی کارەکەیە، دۆزەخ تاریکە. شەرمە، گەورەم، شەرمە! سەربازی و دەترسیت؟- چ پێویستە بترسیت لەوەی کەسێک بیزانێت لە کاتێکا کەس نییە بتوانێت هێزی ئێمە بخاتە بەر لێپرسینەوە؟- کێ دەیزانی ئەو پیرەمێردە ئەوەندە خوێنی  تێدایە؟

**نۆشدەر:** گوێت لێیە چ دەڵێ؟

**خاتوو ماکبێس:** سەرداری (فایف) ژنێکی هەبوو: ئێستا لە کوێیە؟- چی، ئەو دەستانە هەرگیز پاک نابنەوە؟- چیدی ئەمە نا، گەورەم، چیدی ئەمە نا: تۆ بەم راچڵەکینەت هەموو شتێک تێک دەدەیت.

**نۆشدەر:** مخابن، مخابن: شتی وات زانیوە کە نەدەبوا بیانزانیت.

**یاوەرژن:** شتی وای گوت کە نەدەبوایە بیانلێت، لەوە دڵنیام:
خوا دەزانێت ئەو چی دەزانێت

**خاتوو ماکبێس:** بۆنی خوێن هێشتا لێرەیە؛ هەموو بۆن و بەرامەی وڵاتی
عەرەبستان ناتوانن بۆنی ئەم دەستە بچووکە خۆشکەن. ئۆهـ! ئۆهـ!ئۆهـ!

**نۆشدەر:** ئەوە چ ئاهێک بوو! دڵی پڕ خەم و کەسەرە.

**یاوەرژن:** نامەوێت دڵی وام لە سینەدا بێت تەنانەت لەبەر خاتری هەموو لەشیشم.

**خاتوو ماکبێس:** باشە، باشە، باشە،–

**یاوەرژن:** گەورەم، خوا بکات، باش بێت.

**نۆشدەر:** نەخۆشییەکەی لە سەرووی کاری منەوەیە؛ هەرچەندەش من کەسانی وام
ناسیون کە لە خەودا ڕۆیشتوون، بەڵام بە پیرۆزی لەناو نوێنەکانیان مردوون.

**خاتوو ماکبێس:** دەستت بشۆ، جلی خەو لەبەربکە، وا ڕەنگ زەرد مەبە–
جارێکی تریش پێت دەڵێمەوە، بانکۆ نێژراوە: ئەو ناتوانێت لە گۆڕەکەی
سەربێنێتە دەر.

**نۆشدەر:** ئەوەش؟

**خاتوو ماکبێس:** با بچینە ناو نوێن، نوێن. وا یەکێک لەدەرگا دەدات. وەرە، وەرە،
وەرە، وەرە. دەستت بێنە. ئەوەی کرا تازە ناتوانرێت بگەڕێتەوە، با بچینە ناو
نوێن، نوێن، نوێن

(دەڕوات)



**GENTLEWOMAN:**

She has spoke what she should not, I am sure of that:
heaven knows what she has known.

**LADY MACBETH:**

Here's the smell of the blood still: all the perfumes
of Arabia will not sweeten this little hand. Oh, oh, oh!

**DOCTOR:**

What a sigh is there! The heart is sorely charged.

**GENTLEWOMAN:**

I would not have such a heart in my bosom for the
dignity of the whole body.

**DOCTOR:**

Well, well, well,--

**GENTLEWOMAN:**

Pray God it be, sir.

**DOCTOR:**

This disease is beyond my practice: yet I have known those
which have walked in their sleep who have died holily in
their beds.

**LADY MACBETH:**

Wash your hands, put on your nightgown; look not so pale:--
I tell you yet again, Banquo's buried; he cannot come
out on's grave.

**DOCTOR:**

Even so?

**LADY MACBETH:**

To bed, to bed; there's knocking at the gate: come, come, come,
come, give me your hand: what's done cannot be undone: to bed, to
bed, to bed.

[Exit.]

**نۆشدەر:** ئایا ئێستا دەچێتە ناو نوێن؟

**یاوەرژن:** یەکسەر.

**نۆشدەر:** لەناو خەڵکا چرپەی پیس بڵاو بۆتەوە. کاری نائاسایی

کێشەی نائاسایی لێ دەکەوێتەوە: مێشکی دەردەدار

نهێنی خۆیان بۆ بالیفە کەڕەکانیان دەدرکێنن.

ئەو خانمە پتر پێویستی بە قەشەیە نەک نۆشدەر: –

خوای مەزن لە هەموومان خۆش بێت! ئاگات لێی بێ،

هەرچی ئازاری پێ بگەیەنێت لێی دوور بخەوە

هەمیشە چاوت لێی بێت.– ئینجا، شەوباش:

ئەو خانمە مێشکی تێکدام و چاوانمی حەپەساند.

بیرێک لە مێشکمایە کەچی ناوێرم دەری ببڕم.

**یاوەرژن:** شەوباش، نۆشدەری چاک.

(دەڕۆن)



**DOCTOR:**

Will she go now to bed?

**GENTLEWOMAN:**

Directly.

**DOCTOR:**

Foul whisperings are abroad. Unnatural deeds
Do breed unnatural troubles: infected minds
To their deaf pillows will discharge their secrets.
More needs she the divine than the physician.--
God, God, forgive us all! Look after her;
Remove from her the means of all annoyance,
And still keep eyes upon her.--So, good-night:
My mind she has mated, and amaz'd my sight:
I think, but dare not speak.

**GENTLEWOMAN:**

Good-night, good doctor.

[Exeunt.]

## دیمەنی دووەم

### گوندێکی نزیک دەنزینەن

(مێنتــث و کاثــینس و ئەنگەس و لینۆکس و سەرباز
بە تەپڵ و ئاڵای ڕەنگاوڕەنگ دێنە ناوەوە.)

**مێنتــث:** هێزی ئینگلیزەکان لەو نزیکانەن، لەژێر سەرکردایەتی (مالکۆڵم) و
(سیوارد)ی مامەی[١٩] و (ماکدەف)ی چاکەوەیە.
تۆڵە ناخیان گڕ دەدا؛ چونکە کێشە خۆشەویستەکانیان
تەنانەت پیاوی هەست مردووش بۆ ئەو جەنگە
خوێناوییە جەرگ تەزێنە هان دەدات.

**ئەنگەس:** باشترە لە نزیک دارستانی (بێرنام)
پێیان بگەین، چونکە لەو ڕێیەوە دێن.

**کاثــینس:** کێ دەزانێت ئاخۆ دۆناڵبێن لەگەڵ برایدایە یان نا؟

**لینۆکس:** دڵنیام، گەورەم، ئەویان لەگەڵدا نییە من لیستی
ناوی هەموو گەورەپیاوانی ئەو لەشکرەم پێیە، کوڕی (سیوارد)و
چەندین گەنجی لووسکەیان لەگەڵە کە بۆ یەکەم جار
دەیانەوێ پیاوەتی خۆیان بسەلمێنن.

**مێنتــث:** داخۆ کابرای زۆردار خەریکی چییە؟

**کاثــینس:** ئەو بە توندی خەریکی قایمکاری دەنزینەنی مەزنە.
هەندێک دەڵێن شێتە: ئەوانەی کەمتر قینیان لێیە
ئەمەی لێ بەڕقی ئازایانە دادەنێن؛ بەڵام، مسۆگەر
ئەو پێی ناکرێت کێشە ناڕێکەکەی خۆی

(١٩) لە ڕاستیدا (سیوارد) مامی مالکۆڵم نییە، بەڵکو باپیرەیەتی.



## Scene II

### The Country near Dunsinane.

*[Enter with drum and colours, Menteth, Cathness, Angus, Lennox, and Soldiers.]*

**MENTETH:**
The English power is near, led on by Malcolm,
His uncle Siward, and the good Macduff.
Revenges burn in them; for their dear causes
Would to the bleeding and the grim alarm
Excite the mortified man.

**ANGUS:**
Near Birnam wood
Shall we well meet them; that way are they coming.

**CATHNESS:**
Who knows if Donalbain be with his brother?

**LENNOX:**
For certain, Sir, he is not: I have a file
Of all the gentry: there is Siward's son
And many unrough youths, that even now
Protest their first of manhood.

**MENTETH:**
What does the tyrant?

**CATHNESS:**
Great Dunsinane he strongly fortifies.
Some say he's mad; others, that lesser hate him,
Do call it valiant fury: but, for certain,
He cannot buckle his distempered cause

Within the belt of rule.

**ANGUS:**

Now does he feel
His secret murders sticking on his hands;
Now minutely revolts upbraid his faith-breach;
Those he commands move only in command,
Nothing in love: now does he feel his title
Hang loose about him, like a giant's robe
Upon a dwarfish thief.

**MENTETH:**

Who, then, shall blame
His pestered senses to recoil and start,
When all that is within him does condemn
Itself for being there?

**CATHNESS:**

Well, march we on,
To give obedience where 'tis truly owed:
Meet we the medicine of the sickly weal;
And with him pour we, in our country's purge,
Each drop of us.

**LENNOX:**

Or so much as it needs,
To dew the sovereign flower, and drown the weeds.
Make we our march towards Birnam.

*[Exeunt, marching.]*



بخاته ناو چوارچێوەی دەسەڵاتییەوە.

**ئەنگەس:** ئێستا ئەو هەست دەکات
کوشتنە بەدزییەکانی بەدەستەکانییەوە نووساون،
ئێستا یاخیبوونی سات دوای سات سەرکۆنەی پەیمانشکێنی لێ دەکەن:
ئەوانەی فەرمانیان پێ دەکات تەنها بە فەرمانی دەبزوون
نەک خۆشەویستی: هەنووکە هەست دەکات پلە و پایەکەی
لەبەری شۆڕە و دەڵێی جلی فەلامەرزێکە
بە بەر دزێکی کورتەبالاوە.

**مێنتـث:** کەوابێ ئەو گلەیی
لە هەستە شێواوەکانی خۆی دەکات لەبەر هەڵچوون و ڕاچڵەکینەکانی،
لە کاتێکدا هەرچی لە ناخیدایە نەفرەت
لەوە دەکات لەوێدایە؟

**کاپـینس:** باشە: با بچینە پێش،
گوێڕایەڵی خۆمان بۆ ئەو کەسە دەربڕین کە شایەنی دڵسۆزییە
با دەرمانی دەردی خۆمان لەودا ببینینەوە،
با لەگەڵ ئەو، هەر دڵۆپێکی ئێمە
بڕژێنینە ناو وڵات و پاکی بکەینەوە.

**لینۆکس:** یان چەندی لە تواناماندایە هەوڵدەین
گوڵی سەروەری خوناوڕشێن و گیای بژار نقووم بکەین؛
با بەرەو دارستانی (بێرنام) بەڕێ بکەوین.

(دەکەونە ڕێ)

# ديمەنی سێیەم

## دەنزینەن. ژوورێکی ناو قەڵا

ماکبێس و نۆشدەر و یاوەران دێنە ژوور.

**ماکبێس:** چیدی هەواڵم بۆ مەهێنن!: با هەموو هەڵێن

تا دارستانی (بێرنام) نەگاتە (دەنزینەن)

ترسم لێ نانیشێت. (مالکۆڵم )چییە..منداڵە؟

ئەدی ئەو لە ژنان نەبووە؟ ئەو ڕۆحانەی کە سەرەنجامی

هەموو مرۆڤێک دەزانن وایان پێ گوتم:

(ماکبێس مەترسە، هیچ پیاوێکی لە ژنان بوو

هەرگیز بەسەرتا زاڵ نابێت)- هەڵێن، سەردارە درۆزنەکان، هەڵێن.

بڕۆن تێکەڵ بە ئینگلیزە خۆشڕابوێرەکان[٢٠] بن:

ئەو مێشکەی رابەریم دەکاو ئەو دڵەی وا لە سینەم

نە گومان شۆڕی دەکا و نەترسی تێدەچێ زۆر یان کەم.

(نۆکەرێک دێتە ژوور)

شەیتان رووت ڕەش بکات، ئەی نامەردی ڕووزەرد!

ئەو ڕوخسارە قازانییەت لە کوێ هێناوە؟

**نۆکەر:** گەورەم، دە هەزار-

**ماکبێس:** قاز، نامەرد؟

**نۆکەر:** سەربازن، گەورەم.

**ماکبێس:** بڕۆ، ڕوومەتت بئاژنە و ترسەکەت لە خوێن سوێرکە،

هەی زراو رژاو. سەربازی چی، گەوجە؟

---

(٢٠) هۆڵنشیدی مێژووزان دەڵێت: (سکۆتلەندییەکانی جاران مانای خواردنی خۆش و بەدمەستییان نەدەزانی. ئەم شتانە لە ئینگلیزەکان فێربوون).



# Scene III

## Dunsinane. A Room in the Castle.

*[Enter Macbeth, Doctor, and Attendants.]*

**MACBETH.**

Bring me no more reports; let them fly all:
Till Birnam wood remove to Dunsinane
I cannot taint with fear. What's the boy Malcolm?
Was he not born of woman? The spirits that know
All mortal consequences have pronounced me thus,--
"Fear not, Macbeth; no man that's born of woman
Shall e'er have power upon thee."--Then fly, false thanes,
And mingle with the English epicures:
The mind I sway by, and the heart I bear,
Shall never sag with doubt nor shake with fear.

*[Enter a Servant.]*

The devil damn thee black, thou cream-faced loon!
Where gott'st thou that goose look?

**SERVANT:**

There is ten thousand--

**MACBETH:**

Geese, villain?

**SERVANT:**

Soldiers, sir.

**MACBETH:**

Go prick thy face and over-red thy fear,
Thou lily-livered boy. What soldiers, patch?

Death of thy soul! those linen cheeks of thine
Are counsellors to fear. What soldiers, whey-face?

**SERVANT:**

The English force, so please you.

**MACBETH:**

Take thy face hence. *[Exit Servant.]*
Seyton!--I am sick at heart,
When I behold--Seyton, I say!- This push
Will chair me ever or disseat me now.
I have lived long enough: my way of life
Is fall'n into the sere, the yellow leaf;
And that which should accompany old age,
As honour, love, obedience, troops of friends,
I must not look to have; but, in their stead,
Curses, not loud but deep, mouth-honour, breath,
Which the poor heart would fain deny, and dare not.
Seyton!--

*[Enter Seyton.]*

**SEYTON:**

What's your gracious pleasure?

**MACBETH:**

What news more?

**SEYTON:**

All is confirmed, my lord, which was reported.

**MACBETH:**

I'll fight till from my bones my flesh be hacked.
Give me my armour.

**SEYTON:**

'Tis not needed yet.

**MACBETH:**

I'll put it on.



دەک ڕۆحت بچێ! ئەو ڕوومەتە کەتانیانەت
ڕێنماییکەری ترسن، سەربازی چی ، هەی روو زەرد؟

**نۆکەر:** لەشکری ئینگلیزن، گەورەم خۆشبێ.

**ماکبێس:** لەبەر چاوم گوم بە (نۆکەر دەڕوات)_ سەیتەن!–
دڵم تەنگە. سەیتەن، کە دەبینم– دەڵێم!– ئەو تەنگانەیە
یان بەیەگجاری دڵخۆشم دەکات، یان ئێستا لێم دەخات.
من بایی خۆم ژیاوم: ڕەوتی ژیانم
وەک گەڵایەکی زەردی پایز شۆڕ دەبێتەوە؛
ئەو شتانەی دەبێ لەگەڵ پیری دابن
وەکو ڕێزلێنان، خۆشەویستی، گوێڕایەڵی، لەشکری هاوڕێیان،
نابێ من بە دوایاندا بگەڕێم؛ بەڵام، لە جیاتی ئەوان،
نەفرەتی قووڵ نەک بڵند، ڕێزگرتنی سەرزارەکی، دەبیستم،
کە دڵی بەستەزمانم حەز دەکات ڕەتیان بکاتەوە، کەچی ناشوێرێت.
سەیتەن:–

(سەیتەن دێتە ژوور)

**سەیتەن:** بەڕێزتان، چی دەفەرموون؟

**ماکبێس:** دواهەواڵ چییە؟

**سەیتەن:** گەورەم، چیت پێگەیشتووە، لێی دڵنیاین.

**ماکبێس:** تا گۆشتم بەسەر ئێسکانەوە مابێت، دەجەنگم.
زرێیەکەم پێ بدەن.

**سەیتەن:** هێشتا پێویستیت پێی نییە.

**ماکبێس:** من دەیکەمە بەر:

سواران پتر بنێرنە دەرەوە، با بەناو وڵاتدا بسووڕێن؛
ئەوانەی باسی ترس دەکەن لە سێدارەیان دەن. زرێیەکەم بدەرێ.
(بۆ نۆشدەرەکە) نەخۆشەکەت چۆنە، نۆشدەر؟

**نۆشدەر:** گەورەم، ئەوەندە نەخۆش نییە
بەقەد ئەوەی خەیاڵاتی سەخت ئازاری دەدات و
ئارامی لێ بڕیوە.

**ماکبێس:** لەو دەردەی چاک بکەوە:
ناتوانیت مێشکێکی نەخۆش چاک بکەیتەوە،
خەمی ڕەگاژۆی لە یادی دەربکێشی و
کێشە نووسراوەکانی مێشکی
بە دەرمانێکی خۆشی لە بیربەرەوە بسڕییەوە،
سینەی لە ئازار و مەترسی خاوێن بکەیتەوە
کەوا قورس سواری دڵی بووە؟

**نۆشدەر:** کەواتە دەبێ نەخۆشەکە بە خۆی
هەوڵدات چاک بێتەوە.

**ماکبێس:** داوودەرمانت فڕێ بدە بەر سەگان، نامەوێت:
[بۆ سەتین ] وەرە، زرێم بکە بەر، داردەستەکەم بدەرێ.-
سەیتەن، فەرمان دەربکە. (بۆ نۆشدەر) نۆشدەر، سەردارەکانم لێم هەڵدێن:-
(بۆ سەیتەن) وەرە، خێرابە . [ بۆ نۆشدەر] نۆشدەر!
ئەگەر دەتوانی لە ئاوی وڵاتەکەم بڕوانی،
نەخۆشییەکەی بدۆزییەوە و
پاکی بکەیتەوە و تەندروستی جارانی پێ بدەیتەوە،
من وا توند چەپڵەت بۆ لێ دەدەم
دەنگ بداتەوە.- (بۆ سەیتەن) هەڵیکێشە، دەڵێم:-
(بۆ نۆشدەر) دەبێ چ ڕێواس و سینەمەکی یان چ دەرمانێکی ڕەوانکەری دی



Send out more horses, skirr the country round;
Hang those that talk of fear.--Give me mine armour.--
*[To the Doctor]* How does your patient, doctor?

**DOCTOR:**

Not so sick, my lord,
As she is troubled with thick-coming fancies,
That keep her from her rest.

**MACBETH:**

Cure her of that:
Canst thou not minister to a mind diseased;
Pluck from the memory a rooted sorrow;
Raze out the written troubles of the brain;
And with some sweet oblivious antidote
Cleanse the stuffed bosom of that perilous stuff
Which weighs upon the heart?

**DOCTOR:**

Therein the patient
Must minister to himself.

**MACBETH:**

Throw physic to the dogs,--I'll none of it.--
*[To seyton]* Come, put mine armour on; give me my staff:--
Seyton, send out.--*[To the Doctor]* Doctor, the Thanes flyfrom me.--
*[To seyton]* Come, sir, despatch.--*[To the Doctor]* If thou
couldst, doctor, cast
The water of my land, find her disease,
And purge it to a sound and pristine health,
I would applaud thee to the very echo,
That should applaud again.-*[To Seyton]* Pull't off, I say.--
*[To the Doctor]* What rhubarb, senna, or what purgative drug,

ئەو ئینگلیزانە لێرە لاببات؟- ئەرێ هیچیت لەبارەیان بیستووە؟

**نۆشدەر:** بەڵێ، سەروەری چاکم، بە خۆکەوتنی بەڕێزتان

پێمان دەڵێت شتێک لە گۆڕێیە.

**ماکبێس:** (بۆ سەیتەن) بە دوامدا بێنە.-

لێم نانیشێت ترسی مەرگ و شکست هێنان

تا دارستانی (بێرنام) نەگاتە کن (دەنزینان).

(دەڕوات)

**نۆشدەر:** (لەلاوە) هاتبا ئەمجارە بە سەلامەتی لە (دەنزینەن) دەرکەوتبام،

گەلێ زەحمەت بوو پارەوپوول جارێکی تر بەرەو ئێرەی هێنابام.

(دەڕوات)



Would scour these English hence? Hear'st thou of them?

**DOCTOR:**

Ay, my good lord; your royal preparation

Makes us hear something.

**MACBETH:**

*[To Seyton]*Bring it after me.--

I will not be afraid of death and bane,

Till Birnam forest come to Dunsinane.

*[Exit]*

**DOCTOR:**

*[Aside]* Were I from Dunsinane away and clear,

Profit again should hardly draw me here.

*[Exeunt]*

# دیمەنی چوارەم

## گوندێکی نزیک دەنزینەن، دارستانێک دیارە

مالکۆڵم و پیرە سیوارد و کوڕەکەی و ماکدەف و مێنتث و کاثنیس و ئەنگەس و لینۆکس و ڕۆز و سەربازەکان بە تەپڵ و ئاڵای ڕەنگاوڕەنگەوە بەڕێ کەوتوون.

**مالکۆڵم:** ئامۆزاکانم، هیوادارم ئەو ڕۆژانە نزیک بن

که ژوورەکانمان هێمنی و ئاسوودەییان تێدابێت.

**مێنتث:** هیچ گومان لەوەدانییە.

**سیوارد:** ئەوە چ دارستانێکە لە پێشمانە؟

**مێنتث:** دارستانی (بێرنام)ـە.

**مالکۆڵم:** با هەر سەربازەی لقێک ببڕێتەوە و

لە پێش خۆی رایبگرێت: بەم جۆرە ژمارەی

لەشکری خۆمان دەشارینەوە و وا دەکەین

سیخوڕەکانیان هەواڵی هەڵە بگەینن.

**سەربازەکان:** وا دەکەین.

**سیوارد:** هیچ هەواڵێکی دیکە نییە جگە لەوەی زۆردارەکە

مسۆگەر بێ جووڵە لە (دەنزینەن) دەمێنێتەوە و

خۆ لەبەر گەمارۆمان رادەگرێت.

**مالکۆڵم:** ئەوەش ئاواتی سەرەکییەتی،



## Scene IV

### Country near Dunsinane. A Wood in view

*[Enter, with drum and colours, Malcolm, old Siward and his Son, Macduff, Menteth, Cathness, Angus, Lennox, Rosse, and Soldiers,* marching.]

**MALCOLM.**

Cousins, I hope the days are near at hand
That chambers will be safe.

**MENTETH.**

We doubt it nothing.

**SIWARD**.

What wood is this before us?

**MENTETH.**

The wood of Birnam.

**MALCOLM**.

Let every soldier hew him down a bough,
And bear't before him; thereby shall we shadow
The numbers of our host, and make discovery
Err in report of us.

**SOLDIERS:**

It shall be done.

**SIWARD:**

We learn no other but the confident tyrant
Keeps still in Dunsinane, and will endure
Our setting down before't.

**MALCOLM:**

'Tis his main hope:

For where there is advantage to be given,
Both more and less have given him the revolt;
And none serve with him but constrained things,
Whose hearts are absent too.

**MACDUFF:**

Let our just censures
Attend the true event, and put we on
Industrious soldiership.

**SIWARD:**

The time approaches,
That will, with due decision make us know
What we shall say we have, and what we owe.
Thoughts speculative their unsure hopes relate;
But certain issue strokes must arbitrate:
Towards which advance the war.

*[Exeunt, marching.]*



چونکە هەر دەرفەت هەڵکەوێ
گەورە و بچووک لە ڕووی رادەوەستنەوە.
هیچ کەس لەگەڵی نامێنتەوە جگە لەو بەسەزمانانەی
بەبێ دڵی خۆیان ناچارکراون.

**ماکدەف:** با هەڵسەنگاندنمان،
گەر راست بن، ڕووداوەکان بیانسەلمێنن و
وەک سەربازی بە توانا بجوولێینەوە.

**سیوارد:** ئەو دەمە دێتە پێش
بزانین چۆنە بەختمان؛
بزانین چیمان بە دەست هێناوە و چیمان هاتۆتە دۆڕان.
بیری ئەندێشەئامێز ئاواتی نادڵنیا دەدرکێنێت،
بەڵام لێدانی توند و دڵنیایە ئامانج بە دەست دێنێت
با بچینە ناو گەرمەی شەڕەوە.

(دەکەونە ڕێ)

## دیمەنی پێنچەم

### دەنزینەن، ناو قەڵا

ماکبێس و سەیتەن و سەربازەکان بە تەپڵ و ئاڵای ڕەنگاوڕەنگ دێن

**ماکبێس:** ئاڵاکانمان لەسەر دیواری دەرەوە هەڵکەن؛

هێشتا دەنگی هاواری (ئەوان دێن!) دێت، بەڵام

قەڵای قایمان گاڵتە بە ئابلۆقەیان دەکات؛ با لەوێ بمێننەوە

تا برسێتی و دەرد هەڵیان دەوەرێنێت.

هاتبا ئەوان ئەو سەربازانەیان لەگەڵ نەبوایە

کە دەبوایە لای ئێمە بووان، ڕەنگ بوو ڕووبەڕوو لەگەڵیان جەنگاباین و

بەرەو ماڵ ڕاومان بنابووانەوە. (هاوارێکی ژنان لە ناوەوە)

ئەو هاوارە چییە؟

**سەیتەن:** سەروەری چاکم، ئەوە هاواری ژنانە.

(دەڕوات)

**ماکبێس:** وەختە ئەوەی ترسە لە گیانما نەمێنێت.

دەمی وام بینیوە کە دەبوا هەستەکانم سارد ببووان،

هەر کە قیژەی شەوانەم دەبیست و قژی سەرم

بە بیستنی چیرۆکی تۆقێنەر قیت دەبۆوە و

دەجوولایەوە وەک بڵێی زیندووە. من لە ترس تێر بوویم،

ترسی ئاشنا بە بیری خوێنڕێژانەم

چی دی ناتوانێت رامچڵەکێنێت.

(سەیتەن دێتە ناوەوە)

ئەو هاوارە چی بوو؟

**سەیتەن:** گەورەم، شاژن مردووە.



## Scene V

### Dunsinane. Within the castle

*[Enter with drum and colours, Macbeth, Seyton, and Soldiers.]*

**MACBETH.**

Hang out our banners on the outward walls;
The cry is still, "They come:" our castle's strength
Will laugh a siege to scorn: here let them lie
Till famine and the ague eat them up:
Were they not forced with those that should be ours,
We might have met them dareful, beard to beard,
And beat them backward home. *[A cry of women within.]*
What is that noise?

**SEYTON.**

It is the cry of women, my good lord.

*[Exit.]*

**MACBETH:**

I have almost forgot the taste of fears.
The time has been, my senses would have cooled
To hear a night-shriek; and my fell of hair
Would at a dismal treatise rouse and stir
As life were in't: I have supp'd full with horrors;
Direness, familiar to my slaughterous thoughts,
Cannot once start me.

*[Re-enter Seyton.]*

Wherefore was that cry?

**SEYTON:**

The queen, my lord, is dead.

**ماکبێس:** دەبوو پاشتر بمردایە:
ئەوسا کاتمان دەبوو بۆ قسەی وا.-
سبەی و سبەی و سبەی
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە وردەهەنگاو دەخزێت
تا دەگاتە دوا بڕگەی کاتی تۆمارکراو،
هەموو دوێنێکانمان ڕێگای مەرگی تۆزاوییان
بۆ گەوجان ڕووناک کردۆتەوە. ئەی قوونکە مۆم بکوژێوە!
ژیان لە تارماییەکی گەرۆک پتر نییە؛ ئەکتەرێکی بەسەزمانە
کە کاتێ خۆی بەخۆبادان و نیگەرانی لەسەر شانۆ
بەسەر دەبات و پاشتر هیچی لێ نابیسترێ: چیرۆکێکی
پڕ هەراوهۆریا و تووڕەیی بێ مانایە
گێلێک دەیگێڕێتەوە.

(پەیامهێنێک دێتە ناوەوە)

تۆ هاتوویت قسە بکەیت، خێرا بدوێ!

**پەیامهێن:** سەروەری بەخشندەم
ئەوەی بینیومە دەبێ بیڵێم،
بەڵام نازانم چۆنی بڵێم.

**ماکبێس:** باشە، بیڵێ، گەورەم.

**پەیامهێن:** کە لەسەر گردەکە وەستابووم ئێشکم دەگرت و
چاوم بڕیبووە لای (بێرنام) یەکسەر وام زانی
دارستانەکە دەجوولێتەوە.

**ماکبێس:** درۆزن و نامەرد! (لێی دەدات)

**پەیامهێن:** دەک رقی تۆم لێ ببارێت گەر وا نەبێت.
بەڵام بە درێژایی ئەو سێ میلەی نێوانمان کە دەیبینیت،



**MACBETH:**

She should have died hereafter;
There would have been a time for such a word.--
To-morrow, and to-morrow, and to-morrow,
Creeps in this petty pace from day to day,
To the last syllable of recorded time;
And all our yesterdays have lighted fools
The way to dusty death. Out, out, brief candle!
Life's but a walking shadow; a poor player,
That struts and frets his hour upon the stage,
And then is heard no more: it is a tale
Told by an idiot, full of sound and fury,
Signifying nothing.

*[Enter a Messenger.]*

Thou com'st to use thy tongue; thy story quickly.

**MESSENGER:**

Gracious my lord,
I should report that which I say I saw,
But know not how to do it.

**MACBETH:**

Well, say, sir.

**MESSENGER:**

As I did stand my watch upon the hill,
I looked toward Birnam, and anon, methought,
The wood began to move.

**MACBETH:**

Liar, and slave! *[Strikimg him.]*

**MESSENGER:**

Let me endure your wrath, if't be not so.
Within this three mile may you see it coming;

I say, a moving grove.

**MACBETH:**

If thou speak'st false,
Upon the next tree shalt thou hang alive,
Till famine cling thee: if thy speech be sooth,
I care not if thou dost for me as much.--
I pull in resolution; and begin
To doubt the equivocation of the fiend
That lies like truth. "Fear not, till Birnam wood
Do come to Dunsinane;" and now a wood
Comes toward Dunsinane.--Arm, arm, and out!--
If this which he avouches does appear,
There is nor flying hence, nor tarrying here.
I 'gin to be aweary of the sun,
And wish the estate o' the world were now undone.--
Ring the alarum bell!--Blow, wind! come, wrack!
At least we'll die with harness on our back.

[Exeunt.]



دەڵێم، دارستانێکی جوولاوە بەڕێوەیە.

**ماکبێس:** گەر درۆ بکەیت
بە زیندوویی بەو دارەی تەکتەوە هەڵتدەواسم،
تا لە برسان وشک دەبیتەوە: ئەگەر ئەو قسەش راست بێت
باکم نییە ئەگەر تۆش هەمان شتم لێ بکەیت:–
من خەریکە جڵەوی بڕواکانم ڕادەکێشمەوە،
گومان لە قسە دووماناکانی شەیتان دەکەم
کە درۆی وەکو راستین: (مەترسە، تا دارستانی بێرنام
دێتە دەنزینەن)؛– وا ئێستاش دارستانێک
بەرەو دەنزینەن دێت. چەک لە خۆدەن، بڕۆنە دەر
ئەگەر ئەوەی ئەو دەیڵێت بە ڕاست دەرچێت،
نە ماوەی هەڵاتنمان ماوە و نە لێرە مانەوە.
من خەریکە لە خۆر بێزار دەبم و
خۆزگە ئێستا ئەو دونیایە تێکوپێک بچووبایە.
زەنگی مەترسی بکوتە!– ڕەشەبا هەڵبکە! وێرانی بابێت!
هەر هیچ نەبێت کە دەمرین با زریمان لەبەردا بێت.

(دەڕوات)

## Scene VI

**The same. A Plain before the Castle**

*[Enter, with drum and colours, Malcolm, old Siward, Macduff, &c., and their Army, with boughs.]*

**MALCOLM:**

Now near enough; your leafy screens throw down,
And show like those you are.--*[To old siward]* You, worthy uncle,
Shall with my cousin, your right-noble son,
Lead our first battle: worthy Macduff and we
Shall take upon's what else remains to do,
According to our order.

**SIWARD:**

Fare you well.--
Do we but find the tyrant's power to-night,
Let us be beaten, if we cannot fight.

**MACDUFF:**

Make all our trumpets speak; give them all breath,
Those clamorous harbingers of blood and death.

*[Exeunt. Alarms continued.]*



## دیمەنی شەشەم

هەمان شوێن دەشتایی پێش قەڵا

مالکۆڵم و پیرە سیوارد و ماکدەف و هی دی و لەشکرەکانیان
بە لقە دارەوە، بە تەپڵ و ئاڵای ڕەنگاوڕەنگەوە دێنە ناوەوە.

**مالکۆڵم:** ئێستا تەواو نزیک بووینەتەوە، لقە دارەکانتان فڕێ بدەن و
روخساری راستەقینەی خۆتان دەرخەن (بۆ سیوارد) ئەی مامی هێژام،
تۆ و ئامۆزاکەم، کوڕە جوامێرە راستەقینەکەت،
فەرماندەی لەشکری یەک بن: من و (ماکدەف)ی هێژا
بەپێی ئەو نەخشەیەی دامان ناوە
لەوەکانی دی بەرپرسیار دەبین.

**سیوارد:** خواتان لەگەڵ.–
ئەگەر ئەمشەو هێزەکانی زۆردارمان بەرچەنگ بکەوێت
یاخوا بدۆڕێنین ئەگەر دەسوەکەریمان پێ نەکرێت.

**ماکدەف:** با هەموو شەیپوورەکانمان بنووڕێنن: بە هەموو هێز و توانا
فوو بکەنە ناو ئەو پەیامبەرە بە دەنگانەی مەرگ و نەمانا.
(دەڕۆن، نەعرەتە بەردەوامە)

## Scene VII

**The same. Another part of the Plain.**

*[Enter Macbeth.]*

**MACBETH:**

They have tied me to a stake; I cannot fly,
But, bear-like I must fight the course.--What's he
That was not born of woman? Such a one
Am I to fear, or none.

*[Enter young Siward.]*

**YOUNG SIWARD:**

What is thy name?

**MACBETH:**

Thou'lt be afraid to hear it.

**YOUNG SIWARD:**

No; though thou call'st thyself a hotter name
Than any is in hell.

**MACBETH:**

My name's Macbeth.

**YOUNG SIWARD:**

The devil himself could not pronounce a title
More hateful to mine ear.

**MACBETH:**

No, nor more fearful.

**YOUNG SIWARD:**

Thou liest, abhorred tyrant; with my sword
I'll prove the lie thou speak'st.

*[They fight, and young Siward is slain.]*

**MACBETH:**

Thou wast born of woman.--



## دیمەنی حەوتەم

هەمان شوێن، بەشێکی دی ئەو دەشتە

ماکبێس دێتە ژوورەوە

**ماکبێس:** ئەوان منیان لە کۆڵەگەیەک بەستاوەتەوە و ناتوانم هەڵێم،
بەڵام دەبێ ورچ ئاسا[٢١] ئەو گەمەیە تەواو بکەم:- ئەوە کێیە
لە ژنان نەبووە؟ ئەوە چ کەسە.
دەبێ لەو بترسم، خەڵکی دی لەلام ناکەسە.

(سیواردی گەنج دێتە ژوور)

**سیوارد:** ناوت چییە؟

**ماکبێس:** تۆ هەر لە بیستنی دەترسیت.

**سیوارد:** نەخێر، هەرچەندە ناوێکی گڕدارتریش
لەوانەی ناو دۆزەخ لە خۆت بنێیت، لێت ناترسم.

**ماکبێس:** ناوم (ماکبێس)ـە.

**گەنج سیوارد:** شەیتان بە خۆشی ناتوانێت ناوێکی لەوە
رق هەڵسێنترم بەرگوێ بخات.

**ماکبێس:** نەخێر: ترسناکتریش.

**گەنج سیوارد:** درۆ دەکەیت، زۆرداری رق هەڵسێن:
بە شمشێرم ئەو درۆیەت لێ سپی دەکەمەوە.

(بەشەڕ دێن و گەنج سیوارد دەکوژرێت)

**ماکبێس:** تۆ هاتبوویتە دونیا لە ژنان.

---

(٢١) لە سەردەمی شێکسپیردا لە سەرانسەری ئینگلتەرا (واتە بە سکۆتلەندا و ئێرلەندا)شەوە ورچیان بە زنجیر لە کۆڵەگەیەک دەبەستایەوە و سەگیان بەردەدا گیانی تا وەڕسی دەکرد و لایەکیان دەبەزین. خەڵک دەهاتنە تەماشا، بەم یارییەیان دەگوت (ورچ ئازاردان)

فشەم بە شمشێران دێت، گاڵتە دەکەم بە چەکان
کە بۆم هەڵیدەشەقێنن کوڕۆڵەی ژنان.
(دەڕوات)
(نەعرەتەی جەنگ. ماکدەف دێت)

**ماکدەف:** هەرایەکە لەم لایەوە دێت:– (بانگی ماکبێس دەکات).
ڕوخسارت دەربخە، ئەی زۆردار:
ئەگەر تۆ بە شمشێری کەسێکی دی بکوژرێیت،
تارمایی ژن و منداڵەکانم لە کۆڵم نابنەوە.
ناتوانم ئەو (کێرن)ـە[22]، بەسەزمانانە بکوژم
کە بۆ پارە ڕمیان هەڵگرتووە: ماکبێس یان تۆ
یاخود شمشێرەکەم بەبێ دەم کۆڵ بوون و
بەکارهێنان دەخەمەوە کالان. تۆ دەبێ لەوێ بیت،
بەو هەرا و دەنگە دەنگە وێدەچێت یەکێکی مەزن
لەوێ بێت. (لەلاوە) ئەی بەخت، بەس بیدۆزمەوە
چی دیم لێت ناوێت.
(دەڕوات و دەنگی نەعرەتە) (مالکۆڵم و پیرە سیوارد دێنە ناوەوە)

**سیوارد:** بەم لاوە، گەورەم؛– قەڵاکە بە نەرمی خۆی بە دەستەوەدا؛
پیاوانی زۆردارەکە خۆبەخۆیی لێک دەدەن،
سەردارە جوامێرەکان لەو شەڕەدا ئازا بوون.
ڕۆژگارەکە وەختە بەخۆی پێت بڵێت بۆتە هی خۆت.
کەمێک ماوە هەموو شتێک ببڕێتەوە.

**مالکۆڵم:** دوژمنمان بینی
کە شان بە شانی ئێمە دەجەنگان.

**سیوارد:** گەورەم، وەرە ناو قەڵا.

(دەڕۆن. دەنگی نەعرەتە دێ)

(٢٢) سەربازی پیادەی ئێرلەندی بەکرێگیراون.



But swords I smile at, weapons laugh to scorn,
Brandished by man that's of a woman born.
*[Exit.]*
*[Alarms. Enter Macduff.]*

**MACDUFF:**
That way the noise is.-- *[Calling to Macbeth]*
Tyrant, show thy face!
If thou be'st slain and with no stroke of mine,
My wife and children's ghosts will haunt me still.
I cannot strike at wretched kerns, whose arms
Are hired to bear their staves; either thou, Macbeth,
Or else my sword, with an unbattered edge,
I sheathe again undeeded. There thou shouldst be;
By this great clatter, one of greatest note
Seems bruited. *[Aside]* Let me find him, fortune!
And more I beg not.
*[Exit. Alarm.]*
*[Enter Malcolm and old Siward.]*

**SIWARD:**
This way, my lord;--the castle's gently rendered:
The tyrant's people on both sides do fight;
The noble thanes do bravely in the war;
The day almost itself professes yours,
And little is to do.

**MALCOLM:**
We have met with foes
That strike beside us.

**SIWARD:**
Enter, sir, the castle.
*[Exeunt. Alarm.]*

## دیمەنی هەشتەم

### شوێنێکی دی لە گۆڕەپانی جەنگ

ماکبێس دێتە ژوورەوە.

**ماکبێس:** بۆچ وەک ئەو ڕۆمانییە گەوجانە بکەم و

به شمشێرەکەی خۆم خۆ بکوژم؟ کاتێک دەبینم چاکترە

برین لەلاشەی زیندووان بکەم.

(ماکدەف دێتە ناوەوە)

**ماکدەف:** ڕوو وەرگێڕە، سەگی دۆزەخ، ڕوو وەرگێڕە!

**ماکبێس:** لە هەموو خەڵک پتر خۆم لە تۆ لاداوە:

بەڵام بکشێوە، ڕۆحم بە خوێنی تۆوە

یەگجار قورس بووە.

**ماکدەف:** من وشەم نییە،

دەنگم لە شمشێرمدایە، تۆی نامەرد خوێناویتری

لەوەی زمان وەسفی بکات!

(شەڕ دەکەن)

**ماکبێس:** تۆ بەخۆڕایی هەوڵ دەدەیت:

ئاسانترە هەوای نەبڕاو بریندار بکەیت

لەوەی بە شمشێرە تیژەکەت من زامدار بکەیت:

با تیغەکەت بە سەر تۆقەسەری بڕندەدا بێتە خوار:

من ژیانێکی جادووبەندم هەیە

بەرفرمانی ئەوەی لە ژنان بووە نابێت.



## Scene VIII

**The same. Another part of the field.**

*[Enter Macbeth.]*

**MACBETH.**

Why should I play the Roman fool, and die
On mine own sword? Whiles I see lives, the gashes
Do better upon them.

*[Enter Macduff.]*

**MACDUFF:**

Turn, hell-hound, turn!

**MACBETH:**

Of all men else I have avoided thee:
But get thee back; my soul is too much charged
With blood of thine already.

**MACDUFF:**

I have no words,--
My voice is in my sword: thou bloodier villain
Than terms can give thee out!

*[They fight.]*

**MACBETH:**

Thou losest labour:
As easy mayst thou the intrenchant air
With thy keen sword impress, as make me bleed:
Let fall thy blade on vulnerable crests;
I bear a charmed life, which must not yield
To one of woman born.

**ماکدەف:** هەی نا ئومێد خۆت و جادووت؛
دەبا ئەو فریشتەیەی [٢٣]تا ئێستا بەرفرمانی بوویت
پێت بڵێ، (ماکدەف) بە ناکامی
لە پزدانی دایکی هەڵکەنراوە.
**ماکبێس:** دەک بە نەفرەت بێت ئەو زمانەی وام پێ دەڵێت،
چونکە ڕۆح و ئەقڵی زراو بردم[٢٤]
کەواتە نابێ چیدی بەو شەیتانە فێڵبازانە باوەڕ بکەم
کە بەقسەی دوومانایی دەماندوێنن و
بەڵێنمان بەرگوێ دەخەن و
نائومێدیشمان دەکەن. – من لەگەڵ تۆ ناجەنگم.
**ماکدەف:** کەواتە ، ترسنۆک ، خۆ بە دەستەوە بدەو
بژی تا ببیتە سۆدەرەی دونیایێ :
ئێمە تۆمان وەک دڕندەیەکی دەگمەن دەوێ و
لەسەر کۆڵەگە وێنەت دەکێشین و لە ژێری دەنووسین،
"لێرە دەتوانیت زۆردار ببینیت"
**ماکبێس:** خۆ بەدەستەوە نادەم،
خاکی ژێر پێی (مالکۆڵم)ی منداڵ ماچ ناکەم،
خۆم ناکەمە گاڵتەجاڕی قسەی سووکی ڕەش و ڕووتان.
هەر چەندە دارستانی (بێرنام)یش بێتە (دەنزینەن)،
ئەگەر چی بەرامبەر کەسێکی لە ژنان نەبوو وەستابم،
کەچی دوا هەوڵ دەدەم: مەتاڵی جەنگ
دەدەمە پێش جەستەم: دەی، ماکدەف، وەرە دەس،
نفرین لەوەی زووتر هاوار بکا– (ڕاوەستە و بەس!)
(بەشەڕ کردن دێنەوە ناو شانۆ و، ماکبێس دەکوژرێت).

(٢٣) واتە شەیتان.
(٢٤) لە دەقەکەدا هاتووە: لایەنەپیاوانییەکەی زراو بردم.



**MACDUFF:**
Despair thy charm;
And let the angel whom thou still hast served
Tell thee, Macduff was from his mother's womb
Untimely ripped.
**MACBETH:**
Accursed be that tongue that tells me so,
For it hath cowed my better part of man!
And be these juggling fiends no more believed,
That palter with us in a double sense;
That keep the word of promise to our ear,
And break it to our hope!--I'll not fight with thee.
**MACDUFF:**
Then yield thee, coward,
And live to be the show and gaze o' the time:
We'll have thee, as our rarer monsters are,
Painted upon a pole, and underwrit,
"Here may you see the tyrant."
**MACBETH:**
I will not yield,
To kiss the ground before young Malcolm's feet,
And to be baited with the rabble's curse.
Though Birnam wood be come to Dunsinane,
And thou opposed, being of no woman born,
Yet I will try the last. Before my body
I throw my warlike shield: lay on, Macduff;
And damned be him that first cries, "Hold, enough!"
*[Exeunt fighting. Alarms. Re-enter fighting and Macbeth is slain.]*

## ديمەنی نۆیەم

ناو قەڵا

پاشەكشە. شەیپووری كشانەوە. مالكۆڵم و سیوارد و ڕۆز و
سەردار و سەربازەكان بە تەپڵ و ئاڵای ڕەنگینەوە دێنە ناوەوە.

**مالكۆڵم:** خۆزیا ئەو هاوڕێیانەی نادیارن بە ساغی بگەڕابوانەوە ئێرە.

**سیوارد:** هەندێكیان هەر دەبێ نەمێنن، كەچی وەک دەبینم
ڕۆژێكی وا مەزن زۆر بە هەرزانی كڕدراوە.

**مالكۆڵم:** (ماكدەف) و كوڕە جوامێرەكەت دیار نین.

**ڕۆز:** گەورەم، ڕۆڵەكەت قەرزی سەربازی دایەوە:
تەنها ئەوەندە ژیا تا بووە پیاو؛
ئازایەتییەكەشی بەم جۆرە شەڕە چاونەترسانەی
بەشداری تێدا كرد زووتر سەلمێنرا.
بەڵام وەک پیاو كوژرا.

**سیوارد:** كەواتە كوژراوە؟

**ڕۆز:** بەڵێ، لە گۆڕەپانیش هێنراوەتەوە ئەگەر
بارتەقای هێژاییيەكەی خەفەتی لێ بخۆیت
خەمت هەر كۆتایی نایەت.

**سیوارد:** ئەرێ برینەكانی لە پێشەوە بوون؟

**ڕۆز:** بەڵێ، لە ڕووی بوون.



## Scene IX.

**Within the castle**

*[Retreat. Flourish. Enter, with drum and colours,*
*Malcolm, oldSiward, Rosse, thanes, and Soldiers.]*

**MALCOLM:**
I would the friends we miss were safe arrived.

**SIWARD:**
Some must go off; and yet, by these I see,
So great a day as this is cheaply bought.

**MALCOLM:**
Macduff is missing, and your noble son.

**ROSSE:**
Your son, my lord, has paid a soldier's debt:
He only lived but till he was a man;
The which no sooner had his prowess confirmed
In the unshrinking station where he fought,
But like a man he died.

**SIWARD:**
Then he is dead?

**ROSSE:**
Ay, and brought off the field: your cause of sorrow
Must not be measur'd by his worth, for then
It hath no end.

**SIWARD:**
Had he his hurts before?

**ROSS:**
Ay, on the front.

**SIWARD:**

Why then, God's soldier be he!
Had I as many sons as I have hairs,
I would not wish them to a fairer death:
And, so his knell is knolled.

**MALCOLM:**

He's worth more sorrow,
And that I'll spend for him.

**SIWARD:**

He's worth no more:
They say he parted well, and paid his score:
And so, God be with him!--Here comes newer comfort.

*[Enter Macduff, with Macbeth's head.]*

**MACDUFF:**

Hail, king, for so thou art: behold, where stands
The usurper's cursed head: the time is free:
I see thee compassed with thy kingdom's pearl
That speak my salutation in their minds;
Whose voices I desire aloud with mine,--
Hail, King of Scotland!

**ALL.**

Hail, King of Scotland!

*[Flourish.]*

**MALCOLM.**

We shall not spend a large expense of time
Before we reckon with your several loves,
And make us even with you. My thanes and kinsmen,
Henceforth be earls, the first that ever Scotland
In such an honour named. What's more to do,
Which would be planted newly with the time,--



**سیوارد:** کەواتە، بۆتە سەربازی خوا!
هاتبا بەقەد کەڵەمووم کوڕم هەبووان
مەرگی لەوە باشترم پێ ڕەوا نەدەدیتن:
کەواتە، پرسەکەی پرسەیەکی تەواوە.

**مالکۆڵم:** ئەو شایستەی لەمە پتریشەو
من ئەوە دەگرمە ئەستۆ.

**سیوارد:** ئەو شایستەی هەر ئەوەندەیە؛
خەڵک دەڵێن ئەو بە چاکی مرد و قەرزی خۆی دایەوە:
ئیتر خوای لەگەڵ! وا لێرەوە خۆشییەکی دی دێت.

(ماکدەف سەری ماکبێس دێنێتە ژوورەوە)

**ماکدەف:** بژی پاشا! چونکە ئێستا تۆ شایت، بڕوانە
سەری زۆرداری نەفرەتی لە کوێوەیە کات ئازادە.
دەبینم مروارییە هەڵبژاردەکانی شانشین [٢٥]دەوریان گرتوویت،
سڵاوی منیان لە مێشک دەزرینگێتەوە؛
داوا دەکەم لەگەڵ مندا هاوار بکەن،–
بژی، شای سکۆتلەندا.

**هەموویان:** بژی ، شای سکۆتلەندا!

(زرمەی مۆسیقا)

**مالکۆڵم:** نابێ زۆری پێ بچێت
بەرلەوەی خۆشەویستی زۆر و زەبەندتان هەڵسەنگێنم و
مافی خۆتان پێ ببەخشم. سەردار و خزمانم
لە ئێستاوە ئێوە میرن، ئەوەش یەکەمین جارە سکۆتلەندا
ئەو نازناوە دەبەخشێت. هەرشتێکی دی کە پێویستی کردنە
لە ڕۆژانی داهاتوودا سەرلەنوێ دەیانڕوێنین،–

(٢٥) ماکۆڵم وەک تاجە و گەورەپیاوانیش وەکو دانە مرواری دەوری تاجەکەن.

As calling home our exiled friends abroad,
That fled the snares of watchful tyranny;
Producing forth the cruel ministers
Of this dead butcher, and his fiend-like queen,--
Who, as 'tis thought, by self and violent hands
Took off her life;--this, and what needful else
That calls upon us, by the grace of Grace,
We will perform in measure, time, and place:
So, thanks to all at once, and to each one,
Whom we invite to see us crowned at Scone.

*[Flourish. Exeunt.]*



وەک داوای هاتنەوەی ئەو هاورێیانەی لە وڵات دەرکراون و
کە لە ترسی داو و تەڵەو چاودێری زۆردارەکە هەڵاتوون؛
یان گرتنی یاوەرە دڵڕەقەکانی ئەو
خوێنڕێژە کوژراوەو شاژنە شەیتان ئاساکەی
کەوا پێدەچێت بە دەستی پڕ زەبر و زەنگی خۆی
گیانی خۆی کێشابێت؛ _ ئەمە و هەرچی دی پێویست بوو
کە سەرنجمان رابکێشێت، بە پشتیوانی خودا
بەرێکی رایدەپەڕێنین لە کات و شوێنی خۆیدا
جا ئێستا سوپاس بۆ هەموو و بۆ تاکە تاکەتان
لێشتان دەگێڕمەوە بێنە (سکۆن) بۆ تاج نانە سەرمان.

(زرمەی مۆسیقا دێ، دەڕۆن)

**کۆتایی**

لە رێکەوتی ١٩٩٤/٢/٨ لە هەولێر
کۆتایی بەم وەرگێڕانە هاتووە.

# فەرهەنگۆک

تێبینی: مانای هەموو وشە و واژەکانی ئەم فەرهەنگۆکە بە پێی بەکارهێنانیان لە دەقی ئەم شانۆنامەیە بەکارهاتوون، نەک بە پێی مانا گشتییە فەرهەنگییەکانیان.

### ئ

ئەجندە: جنۆکە.
ئەفسوون: جادوو و سیحر.
ئازای لەش: ئەندامی لەش.
ئاسوودەیی: بێ خەمی، ئاشتی و تەبایی.
ئاژنین: تێ چەقاندن، تێ راکردن.
ئێشک گرتن: نۆبەت گرتن.
ئەندۆ: بیری خەفەتناک.
ئاشکار: ئاشکرا.
ئامان: قاپ و قاچاغ.

### ب

برین: زام.
بەڕۆمەت: بەشەرەف و ڕووسوور.
بارتەقا: بەقەد، هێندەی.
بۆلاندن: بۆڵە و مرەکردن (تذمر).
بایی خۆم: بەقەد خۆم.
بووکۆکە: بووکەشوشە.
بجمن: بجوولێن.
بوغزاوی: پڕ رق و کینە.
بنەچەکە: ڕەگەز و نەژاد، باوو باپیران.
بەرفەرمان بوون: گوێڕایەڵ بوون بۆ فەرمان پێکردن.
بالیف: سەرین.
باک: پەروا.
بەرزەفتنەکراو: دەستبەسەردا نەگیراو.
بەرزەفت بوون: راگیر بوون.
بە ساپیتە نەگیراو: سەر دانەپۆشراو.
بەدمەستی: یەکجار زۆر خواردنەوە، بە تەواوی بێ هۆشی.
باکێش: ئەو کونەی دووکەڵی ناو ماڵی لێیەوە دەردەچێت.
بسک: زولفی درێژ.

### پ

پێ ڕەوادیتن: بەشایەن زانین: پێ شایستە بوون.
پاکار : نۆکەر.
پەلک: گەڵا.
پەرەگەی ئاسمان: بەرزترین پنتی دیار لە ئاسمان.
پاڵەوانە: جۆرە دیوارێکە بەبەر دیواری بەلاداهاتووودا هەڵدەبڕێت تا نەکەوێت.
پەسنین: پێداهەڵگۆتن.
پرووکاندن: دافەتاندن: لە پەل و پۆ خستن.



پێش قەرەوڵ: ئەو دەستەسەربازەی لە پێشەوەی سوپا دەڕۆن.
پشکێک: دڵۆپێک: تنۆکێک.
پاراو: پڕئاو، تێراو.

### ت

تەپکە: جۆرێک لە راوکردنی باڵندەیە.
تلانەوە: ئازار کێشان لە خەفەت و ناخۆشیدا.
تەڵخە خوێناوی: خوێنی پات پات بە شوێنێکەوە وشکەوە بوو.
تەیان: نۆکەری ئافرەت.
تاوانە: پارەی لێ سەنراو لە پای کەتنێک: (غرامە).
تووردان: تێهەڵدان، فڕێدان.
توورندی بوون: دەرچوون لە سروشتی خۆ.
تەپک: تەپکە ریخ.
تیامان: دۆش دامان، سەرسام مان لە کارێکا.
تارمایی: تاپۆ (شبح).
تامەزرۆ: یەگجار شەیدا، زۆر پەرۆشدار.
تۆقەڵان: تەوقی سەر.
تێ ناکەوین: ژێر ناکەوین.
تەفرەدان: هەڵخەڵەتاندن.
ترووکان: ترەکان: لە دایک بوون.
تێ تەقاندن: دەرپەڕین بەتاو، هەڵاتن بە تاو.

### ج

جرجرە: مەگەزێکە لە باخچەی ماڵان دەژیت و لە جۆبرکە دەچێت بەڵام بچووکترە.
جڵەوگیراو: بەرزەفتکراو.
جینجر: پەڵەپەڵاوی ڕەنگاوڕەنگ.
جادووبەند: بەسیحر پارێزراو بەهۆی جادووەوە.

### چ

چک بوون: لە هەڵقولان وەستان: وشک بوونەوە.
چوارناڵە: جۆرە راکردنێکی یەگجار خێرای ئەسپە.
چرپە: قسەکردنی نزم و بە نهێنی.

### ح

حەپۆڵ: گێژو وڕ.

### خ

خەرتەل: خەرداڵ، جۆرە باڵندەیەکی راوکەری زلە.
خوناو: شەونم.
خانەخوێ: خاوەن ماڵ کە میوانی هەبێت.
خشڵ: زێڕ و زیو و شتی بە نرخ کاتێک ئافرەت خۆی پێوە دەرازێنێتەوە.
خەفەتناک: پڕ خەفەت.
خاکەڕا: بێ فیز، متواضع.
خاس: چاک.
خاپینۆک: فێڵباز.
خەنی: شاد و کامەران.
خەوبردە: خەو بردووەوە.
خۆمەڵاسدان: خۆ حەشاردان، خۆ لەپەنا نان.
خۆزگە: بریا، خۆزیا.
خوان: مێزی نانخواردن.

## د

دەرەونەوە: بەرەو دوا دەکشێنەوە و هەڵدێن.

دەرۆزەکەر: سواڵکەر.

دەیهاواراند: هاواری دەکرد.

دەمامک: قناع.

دەسوەکەری: داکۆکی لە خۆکردن و دەست کردنەوە.

دلۆڤان: دڵنەرم و بە بەزەیی.

دووزەلە: ئامرازێکی مۆسیقییە لە دوو قامیش و دوو پیک پێک دێت.

دەربار: بلاط.

دمکانە: بەرێکی لینجی جۆرە رووەکێکە لە ئینگلتەرا بۆ راوی باڵندەی بچووک بەکاردێت.

دەخاپێنێت: هەڵدەخڵەتێنێت.

## ر

رەتاندن: یەکجار هیلاک کردن، برست لێ برین.

رۆیاندن: لە جێگای خۆی جوولاندن، بەرەو پێشەوە بردن.

راژەنین: راهەژاندن.

رەگاژۆ: رەگ بەقوولاداچوو.

رامانـدەچڵەکێنن: لە ترسان موچڕکمان پێدا دێنن؛ لەرزمان لێ دێنن.

## ز

زرمە: لێدانی مۆسیقا بە توندی.

زراوبەر: تۆقێنەر.

زیراندن: هاوار و قیژاندنی ژنان.

زرک: بێ بەر، نەزۆک.

زرووکاندن: دەنگێکی تیژە لە کاتی هاوارکردنی مشک و گیانلەبەری مشک ئاساوە دێت.

زرێدار: بە زرێ داپۆشراو.

زمان کولکردن: پفکە و سۆ لە زمان هێنان.

## ژ

ژیکەلانە: شۆخ و شەنگ، قشت و رند.

ژاکان: سیس بوون، چرچ بوون.

## س

سەرسامی: سامگرتوویی، واق ورماوی.

ساقەسۆرە: زەڕنەقوتە.

سڵەمینەوە: رەوینەوە.

سەرنگون: سەرنخون، سەراوژێر.

ساتمەکردن: سەرسمک لێدان.

سەرتێکردن: سەرتێ نان.

سروش: وحی.

سۆدەرە: گاڵتە پێکراو، عاجباتی.

سۆزانی: ئافرەتی داوێنپیس.

سەگی گورگەمێش: سەگێکە لە گۆڵەگورگ و دێڵەسەگ کەوتبێتەوە.

## ش

شڕ: تەواو بێ حاڵ.

شایلۆغان: دەعوەت و گۆڤەند و بەزم و رەزم.

شاقەڵ: لچکی خوارەوەی جل.

شازادە: نەوەی شا.

شوشتنگا: جێگای شت لێ شوشتن.

شەیپوور: ئامرایکی مۆسیقییە.(بوق).



## ف

فت کردن: لەناوبردن، کوشتن.

فەلامەرز: مرۆڤی زلی نەفرەجا، عملاق.

فەڕ: خێر و بەرەکەت، پیت و بەرەکەت.

فروسماندن: سیحر لێکردن،سیحراوی کردن.

فیسقە گوللە: جۆرە باڵندەیەکی بچووکی رەنگاورەنگە.

## ق

قەڵەمرەو: ئەو ناوچەیەی کە فەرمانڕەوایەک فەرمانی بەسەردا دەڕوات.

قەرەبەقەرە رۆیشتن: شان بەشان رۆیشتن.

قووچەک: هەرشتێکی شێوە کەللە قەندی (هرم)

قرێژین: پیس و پۆخڵ.

قغەی قەلەڕەش: دەنگی گڕی قەلەڕەش.

قورناویلکە: جۆرە گیانلەبەرێکە لە بەهاران لەناو ئاوان پەیدا دەبێت.

قووقە: دەنگی بانگدانی کەڵەشێر.

قەڵبەزە: ئاوی بەقۆنگەرە.

قەلەباچکە: جۆرە باڵندەیەکە لە قەل بچووکترە.

قازان: مەنجەڵی گەورە.

قاو: دەنگوباسێکە بڵاو بووبێتەوە.

## ک

کۆڵەکە: ئەستوونده.

کالان: کیفک.

کلۆم: قوفڵ.

کولک: دومەڵ، کووان، زامی پرکێم.

کرپبوون: بێ دەنگ بوون.

کەڤر: بەرد.

کەرەنا: ئامێرێکی مۆسیقییە(بوق).

کەلاش: لاشەی مردوو.

کارمامز: بەچکە ئاسک.

کەسەر: کولک و کوڤان، خەم و خەفەتی گەورە.

کۆللارە: جۆرە باڵندەیەکی راوکەرە.

کارامەیی: شارەزایی و لێزانی.

کۆڵ: ئەو دەفرە لاکێشەییەیە درێژەیە ئاژەڵ ئالیکی تێدا دەخوات.

کۆڵی دڵ: خەم و خەفەتی دڵ.

کونەباجە: کونە پەنجەرەی سەر لێواری شوورەی قەڵا.

کوزکێشی: مەرایی.

کن: لای، نک.

کەمدوو: کەسێک کەم قسە بکات.

کەللەسەرخانە: شوێنێکی پڕ کەللەسەری کوژراوان.

کیها: کامە.

کەزی: قەفە پرچی درێژ.

کێرد: چەقۆی گەورە.

کەتن: تاوانی گەورە.

کونۆکە: کونێکی بچووک.

کوودەڵە: بێچووە بەراز.

## گ

وردە هەنگاو: پێنگاڤی بچیک.

گێژینگ: جۆرە گیایەکی ژاراوییە، بە خواردنی مرۆڤ گێژو وڕ دەبێت.

گوزەرگا: کەلێنێک گوزەری پێدا بکرێت.

گەڕ و گێچەڵ: تەشقەڵە.
گەوج: بێ مێشک.
گـڵـێـنەی چاو: کـچـێـنەی چاو، بەشــە ڕەنگینەکەی چاو، ڕەشێنەی چاو.

**ل**

لە گۆڕێدایە: لە ئارادایە.
لێرەوار: شـوێنێکی چڕەڵان، شـوێنێک بە دار و دەوەن چڕ بێت.
لووراندن: هاوارکردن بە سەدای گورگ.
لالانەوە: نووزانەوە، کڕووزانەوە.
لێ رسکاندن: لێ ڕواندن.
لێ هاتن: دەردگـرتن، پەرکـەم گـرتن، فێ لێ هاتن، پەژی گرتن.
لیچ: لینج.
لووسکە: موو لێ نەهاتوو.

**م**

مەینەت: خەم و خەفەت.
میتافیزیکی: ئەودیو سروشتی هەستپێکراو.
مـردووخـانە: شـوێنی مـردوو تێدا هەڵگرتنی فەلان.
مەرگین: پڕ لە خەیاڵی مەرگ.
مخابن: حەیف، ئاخ و داخ.
ماڵۆس: بەرازی مێینە.
مەتاڵ: شـتێکی وەک ساجە شەرکـەر لە پێش خۆی رایدەگرێت تا خۆی پێ لە شیر و تیر و رم بپارێزێت.

**ن**

نۆشدەر: نۆژدار، نژدار، پزیشک.
نیر: ئەو دارەی دەیخەنە سـەر ملی گاجـووت:
لێرە بە مانای زوڵم و زۆرداری دێت.
نەقیزە: زەختە.
نۆش پێ بەخشین: وشـەی (بەگـیـان کـەوتن) یان (عـافـیـەتـتـان بێت) ئەمـەش بە زۆری لەســەر مــێــزی خــواردن و خواردنەوە بەکاردێت.
نائومێدبوون: بێ ئومێدبوون، هیوابڕان.
نووڕەی کەڕەنا: دەنگی بەهێزی کەڕەنا .
نغرۆکردن: نقوم کردن.
نانی شـێـو: نانی ئێواران بەتایبـەتی ئەگـەر درەنگ بخورێت.
نەوی: نزم.

**ه**

هەڵزڕاند: هەڵدڕی.
هەرە: بڕۆ.
هێڵ بـوونەوە: دامـان بەدەم بیـرکردنـەوەیەکی قووڵ.
هەرزەگۆ: زۆر بلێی بێ مێشک.
هەڵتـیزاندن: دەرپەڕین و جـووتکە هـاویشـتن و تێ تەقاندنی لە نکاوی ئەسپ و هتد.
هاوار و ڕۆڕۆ: داد و فیغان.
هەرامە: هێن، ئەندامی زاووزێ.
هەسان: جۆرە بەردێکە چەقۆ و شمشێری پێ تیژ دەکەنەوە.
هەڵمەدوو: دووکەڵی هەڵماوی.
هەڵکوتانە سـەر: هورژم بردنە سـەر، شـالاو کردنە سەر
هەژدەر: ئەژدەر، حەزیا .
هێورکردنەوە: ئارام کردنەوە.
همف: وشەی فشە پێکردنە.



**و**

وەنەوزدان: خەوە کوتکە بردنەوە.
ورتە نەهـاتن: مـتـەق نەکـردن، قـســە لە دەم دەرنەهاتن.

**ی**

یاوەر: هـاوەڵ. (مرافق).
یاوەرژن: ئەو ژنـەی بەردەوام لەگـەڵ شـاژن و گەورە ژناندایە. (وێیفە)

زۆر ســوپـاس بۆ هـاوڕێی خــۆشــەویست کــاک شـــوان ســەرابی کــە پێش لەچاپدانەوەی چاپی دووەمی ئەم شـانـۆیـیـە کـۆمـەڵێک تێـبـینی زمـانـەوانی پێشکەشم کرد کە هەندێکیان بەڕاستی سوودمەند بوون. هیوادارم نموونەی لە ئەدەبی کوردیدا زۆر بێت.

وەرگێڕ

# پێڕست